# سێ شەو
# لە
# زیندانی بەعسیە فاشیستەکاندا لە عیراق



دارا مەحمود

دارا مەحمود

# سێ شەو

# لە

# زیندانی فاشیستە بەعسیەکاندا لە عێراق

# پێشکەش

- بەو دڵە گەورانەی فاشیستەکان لە
  لێ دانیان خستن .
- بەو تێکۆشەرانەی ئێستا لەژێر ئازارو
  ئەشکەنجەی زیندانەدا دەناڵێنن .
- بەهاوڕێو خۆشەویستم (چیمەن) .

## - پێشەکی -

خوێنەری بەڕێز: ئەوەی لەبەر دەست
دایە دروست کراوی خەیاڵ، یان هەڵبەستراو نییە،
بەڵکو بریتین لە ڕووداوی ڕاستەقینەو لە
زاری ئەو کەسانە وەرگیراوە کە بە چاوی
خۆیان زیندانی فاشیستەکانی عێراقیان
دیوەو لە ناو ڕووداوەکانی دا ژیاون . ئەوەی
من لێرەدا پێ ی هەستاوم ئەوەیە کە ئەو
ڕووداوانەم لە شێوە چیرۆکێکدا کۆکردوتەوە
، بۆ ئەوەش ڕووداوەکان بچڕ بچڕ نەبنو
خوێنەر سەری لێ نەشێوێ دوو قارەمانی
سەرەکیم بۆ دروست کردون کە ئازادو خالیدن،
ئازادو خالید نمونەی سەدان و هەزاران ڕۆڵەی
ئەو گەلەن کە کەوتونەتە بەر کەڵبەی
خوێناوی بەعس و بەتاوانی ئەوەی هیچ تاوانێکیان
نەبوە تازەترین ڕێوشوێنو دەزگای ئەشکەنجە
دانیان لێبەتاڵی کردونەوە و لە ناویان
بردون .

ئەوەی لێرەدا نوسراوە بەشێکی یەکجار
بچوکی ئەو تاوانو کردەوە درندانەیە کە

دام و دەزگاکانی بەعس کردویانەو دەیکەن .

هیوادارم بەهەموو کەموکوڕیەکەوە توانیبێتم کەلێنێکی بچوك پڕ بکەمەوە .

دارا مەحمود

١٩٨٥

شێوارە وەختان بوو ، دنیا کەمێک تاریک بوو ، نم نم باران دەباری ، شەقامەکە مەیلەو چۆڵ بوو ، تەماشایەکی کات ژمێرەکەی کرد ، دیار بوو کەدەیویست زوو بگاتەوە ماڵێ ... نزیک بۆوە دیتی دایکی لە بەر دەرگا ی حەوشە ڕاوەستاوە ، زانی کە چاوەڕوانی ئەوە ، ڕوو ی تێ کردو گووتی :

— دایە پێم نەگوتی ئەگەر درەنگ هاتمەوە دڵتان هیچ نەکاو لە بەردەرگا چاوەڕوانم مەکە ، ئەوە سەری سەدەمین جارەو تۆ واز لەم پیشەی خۆت ناهێنی ، خۆ من منداڵ نیم وون بم یان چیم لی دێ قابیلە گورگ دەمخوا .

— ڕۆڵە گیان دڵی دایک وانالێ ، خۆزگە تا ئەو کاتە دەمام کە دەمدی تۆ ژن دەهێنی و منداڵت دەبی جا دەمزانی بۆ منداڵەکانی خۆت چون دەبی ، ئاخر کوڕی خۆم زرونەکەی ئالەبارە دەڵێم خوانەخواستە گوێ ی ئەیتان کەرێ ئەوەک تووشی شتێک بی ..

— تووشی چ دەبم !!؟ چم کردوە تاتووش بم ..؟

— دە تۆ بالەبەر ئەو بارانە ڕانەوەستین و بچینە وە ژوورێ جا پێت دەڵێم ..

هەر بەرێگاوە دایکی سەری هێنابە پیشێ و وەک پلێ ی ئەوەک کەسێک گوێ ی لی بێ بە هیواشی

گووتی :ـ

ـ بە قوربانت بم بۆچی کوری ئەو خەڵکە چیهان کردوە کە ئەو کارەیان پێ دەکەن ، لاڵ بم بۆی ، دەڵێن کورەکـــەی بەهیە خان سێ رۆژە بێ سەرو شوێنە . گوڵچینی ئەحمەدە فەندیش دەیگووت گوایا .... ئۆه..خوایە لە عەزیزو خۆ ـ شەویستمانی بەدوور کەی ، دەیگووت دوێنێ جەنازەی (٦٠) کەسیان داوەتەوە بە کەسو کاریان کە ئیعدام کــراون رەبی نەمێنم دەیگووت چاویشیان هەڵکۆڵیون . تو خــوا رۆڵــە ئاگات لە خۆت بێ هەقت بە سەر هیچەوە نەبێ..
ـ ( بەتەوسێکەوە ) باشە بەسەر چاو .

ئازاد وەك هەموو شــەوێك ئانی ئیوارێ ی خواردو چوە ژوورەکەی خۆی ، دەستی بە خوێندنەوە کرد. کات ژمێـــر دەوروبەری ( ١٠ ) بوو ، گوێ ی لە دەنگی ئۆتۆمبیل بوو کە لە بەر دەرگا راوەستا ، چاوەرێ بوو لەدەرگا بدرێ بەلام لێ نەدرا ، هێندەی پێ نەچوو دەنگە دەنگێکی نــا ئاسایی و تەپە تەپی پێ دڵیان داخورپاند ، ماوەیـــەك گوێ ی هەڵخست پاشان پەردەی پەنجەرەی ژوورەکەی لادا ، دیتی بەسەر دیواری حەوشەدا بازیان دایە ئەم دیو. ئازاد چوە دەرێ و دیتی حەوشەو سەربان پڕ لە چەك بە دەستن، دایکیشی لە ترسان هەڵدەلەرزی و لەبەرخویەوە دەیگووت:

خوایە هاوار مەحزوزمان کەی ..

یەکێکیان لە شازاد هاتە پێشێ و توند مەچەکی گرت ، مێ چوارێکی دیکەش هەر بە پێلاوەوە بەسەر جێو یان وەربون، بابی لێیان هاتە پێش و بە نەرمیکەوە گووتی :-

- برایینە فەرموون چتان دەوێ ..؟

یەکێکیان وەلامی دایەوەو گووتی :-

- مالەکەتان دەپشکنین و بۆ چەند دەقیقەیەکیش کورەکە- تان دەبەین هەندێك پرسیاری لێ دەکەین و دەینێرینەوە.

دایکی لەولاوە روی لەکچەکەی کردو بە بە شۆکاویەوە گووتی :-

-کچە تیو من لە عەرەبی ناگەم ، دلم تۆقی پێم بلێ بزانم ئەوانە چی یان دەوێ،کورەکەم بۆ کوێ دەبەن ...؟

فریا نەکەوت وەلامەکە وەرگرێتەوە ، شازادیان بەر ە و دەرێ پەلکێش کرد .

شازاد گووتی :-

-ئاخر بەبێجامەوە بۆ کوێم دەبەن هیچ نەبێ با خوم بگۆرم .

- پێویست ناکا خۆت بگۆری ، هەر ئێستا چەند پرسیارێکت لێ دەکەین و دەگەرێ یەوە .

دایکی و خوشکەکانی کەوتنە پارانەوەو لالانەوە بەلام

کەس گوێ ی پی نەدەدان ..

شازادیان لە پشتی ئۆتۆمبێلێك سوارکردو چاویان بە پارچە پەرۆیەك توند بەست ، ئە وەی لای چەپیەوە دانیشتبوو دەرزیەکی بەدەستەوەبوو ، شازاد شان و شەپلکی هیچ نەمابوو هێندەی کابرا دەرزی تێ هەڵچەقێنێ ، لە گەڵ هەموو تێ هەڵچەقاندنێك رادەچڵەکی و دەستێکی بۆلا ی شانی دەبرد ، تاجارێکیان جگەرەیەك بە دەستی کەوتو سوتاندی ، یەکەم جار وای زانی بەرێ کەوت بوو، بەلاّم کە دووبارەو سێ بارە بۆوە و هەموو جارێکیش دەیاندایە قاقای پێکەنین راستیەکەی بۆ دەرکەوت و ئیدی چەند دەرزیان لە شانی هەڵچەقاند نەیوێرا دەست بۆ شانی ببا زۆری پێ سەیر بوو کە وای لی دەکەن ، چونکە چاوەڕێ نەبوو هەروازوو دەست بە ئازار دانی بکەن ، بەهەموو دڵێکیەوە باوەڕی کردبوو کە چەند پرسیارێکی لێ دەکەن و دەینێرنەوە .

شازاد چونکە چاوی بەسترابوو نەیدەزانی ئۆتۆمبیلەکە بە کوێ دا دەڕواو بەرەو کوێ یە . پاش ماوەیەك هەستی کرد ئوتۆمبیلەکە ڕاوەستا ، دەرگاکەی کرایەوەو یەکێك لەدواوە پاڵێکی توندی پێوە نا ، وای زانی لە سەر کێوێکی بەرز فڕێ یاندایە خوارێ ، ویستی راست بێتەوە

بەلام قۆنداغە تفەنگێك جارێكی دی لەگەڵ زەوی جووتی کردەوە ، بە قژ بەرزیان کردەوەو رایان کێشا ، لەناو شازاری سەرو پرچی چاوی لەبن پەرۆکەوە پڕ لە ئاو بوون، وەکوکوێر دوایان کەوتبوو پەلی دەکوتا . پاش ماوەیەك هەستی کرد دەرگایەك لەبەر دەمی کرایەوە پالێکیان بۆ ژووریٚ پێوە نا، بۆنێکی ناخوش بەلوتی دا هات، زانی کە ئاو دەست خانەیە . زیاتر لە سەعاتێك مایەوە کەس بەلای دا نەهات . ترسێکی زۆر باڵی بە سەردا کێشا- بوو ، لەسەرمانیش خۆی بە سوچێکەوە گرمولە کردبوو، لە پڕ گوێ ی لێ بوو کەدەرگاکە کرایەوە ، وای زانی بانگی دەکەنە دەرێ و یەکسەر هەستایە سەر پێ بەلام چەپۆکێك دایئیشاندەوە ، هەستی کرد شاوێکی مەیلەو گەرمیان بە سەرو چاودا کرد .... ئیدی هەرچی ئەو شەوە بو ئاودەست خانە هات میزەکەی بە سەرو چاوی ئەو دا کرد .

شازاد بەو هەموو هێمنیەی خۆیەوە، تورەبوبێزاری وا- یان لێ کردبوو ، بەو چاو بەستراویە دەیویست دەست بنێتە بینە قاقایان و تا نەیان خنکێنی بەریان نەدا .. دەیویست تا دەتوانێ بەسەریاندا هاوار بکاو پڕ بە دەم تف لە ناو چاوانیان بکا . دوو سێ جاریش هاتە

سەری تاهیٚزی تیٚدایە سەری خۆی بە دیواری شاودەست خانەکەدا بدات، بەڵکو مێشکی بتەقیٚو لە کۆڵ ئەم ژیانە بیٚتەوە .. بەڵام هەرزوو هیٚمن بۆوەو لەدڵی خۆیدا بە خۆی گووت :-

( هەروا زوو شازاد .. خۆ تۆ خۆت بە پاڵەوان دەزانی جاریٚ لە کویٚتە ؟ خۆت بۆ شازارو ئەشکەنجەی قوورس تر ئامادە کە ؟ ئەی تۆ نەبوی دەتگوت زیندان و ئەشکەنجە چی بە پیاو خۆی لە بەر ڕانەگری ؟ فەر مووئەمەیە زیندان ، زۆرت شانازی دەکردکەسواری ئوتومبیلەکە یان کردی ) .

شازاد لاویٚکی بیست و پیٚنج ساڵان ، باڵابەرزو چوار شانە بوو، قژیٚکی ڕەش نیوەی گویٚچکەی داپۆشیبوو، هەمیشە بزەیەکی ناسك لە ژیٚر سمیڵە ڕەشەکانیەوە دیار بوو ، کە قسەیەکی خۆشی گویٚ لیٚ بوایە لە قولاّیی دڵیەوە پیٚ دەکەنی ، لە چاوانی دا ڕاستی و پاکی بە دی دەکرا ، هەر بۆیە لە خۆیەوە دەیڕوانیە خەڵکی دیکەو وای دەزانی هەموو کەس ڕاست و پاکن ، ڕقی لە کەس نەدەبۆوە و دەیویست هەموو کەسیش ئەویان خۆش بویٚت . شازاد دڵنیا بوو لەوەی ئەو ڕیٚگایەی هەڵی

بژاردوە ڕێگایەکی ڕاستەو بە هەموو دڵیەوە بۆی تێ دەکۆشاو ئامادە بوو هەموو شتێک تەنانەت ژیانیش لەپێناو سەرکەوتنی دا بەخت بکا، بڕوایەکی تەواویشی بە هەموو ئەو کەسانە هەبوو کەبەیەکەوە خەباتیان دەکردو بە نزیکترین کەسی لە خۆیەوە دەزانین ، بۆیە کاتێك پێش دوو ڕۆژ فەرهادی هاوڕێیان گیرت لەو بڕوایە دا نەبوو تۆزقاڵێك خیانەتی لێ بوەشێتەوە بەڵکو دڵنیا بوو لەوەی ئەگەر زیندان و ئەشکەنجە ناچاری هەموو شتێکی بکەن هێشتا ناتوانن ناوی هاوڕێ خۆشەویستەکانی پێ بدرکێنن . بەلام قسەی ئەو هاوڕێ بەشی هەر لە بیر بوو و لە گوێ ی دا دەزرینگایەوە کە هەر ئەو ئێوارەی بەسەردا بۆ شەوێ گیرا بە چەند سەعاتێك بەر لەگەڕانەوەی بۆ ماڵێ پێی گووتبو :-

( ئەوەی بکەوێتە بەر دەستی ئەوانە وەکو هەمو شتێك ڕەفتاری لە گەڵدا دەکرێت وەکو مرۆڤ ئەبێ ، ئەوەی کە لە ئازارو ئەشکەنجەی دڕندانە بەبیرت دا نایەت ئەوانە لە گەڵ کەسانی پاك و نیشتمان پەروەر بەکاری دێنن . هەروا پێویستە ئەو ڕاستیە بزانین

که هەموو مرۆڤێك قابیلی گۆڕانە ، شازایی و بە
بڕوایی لە ڕوکەشدا دەرناکەوێ کەسانی وا هەبون
لە پلەی هۆشمەندی و شت زانین دا کەسیان
نە گەیشتوتی ، خەڵکی وایان زانیوە ئەوانە پاڵەوانن و
هێز نی یە بە چوکیاندا بێنێ ، کەچی لەگەڵ یەکەم زللە
هەرچی لە هەمیانەکەیاندا بوە هەڵیان ڕشتوە.
کەسانی واسادەو بەڕوالەت ترسنۆکیش هەبون کەس
تێ ی ڕا نەدیون کەچی لە بەر دەمی دوژمندا وەکو
دیوارێکی پۆلاین ڕاوەستاون و نەیانتوانیوە تاکە
وشەیەکی پێ بدرکێنن و لە باوەڕەکەی پەشیمانی
کەنەوە ..... ) .

شازاد کە قسەکانی ئەو هاوڕێ یەی بیر دەکەوتەو
لە دڵی خۆیدا دەیگوت :-

( لێم ببورە ، هاوڕێ خوشەویستەکەم ، کاتێك پێت
دەگوتم ; دەبی ئاگاداری خومان بین و بەر دەستی
دوژمن نەکەوین ، گاڵتەم پێت دەهات ، بڕوام نەدەکرد
هەروازوو فەرهاد ناومان ئاشکرا بکات ، بە هەڵە داچوم
لە سەرم پێویست بوو قسەکانت جێ بە جێ بکەم
ئێستاش کە من گیراوم هیوا دارم تۆو هاوڕێ خۆشەویستە
کانی دیکەم ، خۆتان شاردبێتەوەو بەر دەست نەکەوتبن).

بەیانی یەکێك لێ ی هاتە ژووری و پەرۆکەی لە
چاوی کردەوە ، دیتی نانێکی بە دەستەوەیە ، تاکو
توانی نانەکەی بە تف و بەڵغەم سواخ دا ئەوجا دایە
دەستی و گووتی :
- فەرموو ئەمەش نانی بەیانیت ..
ئەمەی گووت و پەرۆکەی لەجاری پێشوو توند تر بە
چاویەوە بەستەوە ..
شازاد هەرچەندی کرد نەیتوانی دەم بۆ نانەکە
بباو لەڕاست خۆی بەری دایەوە خواری .
هێندەی پێ نەچوو هاتن و بردیانە دەرێ بەلام چۆن
بردنێك ، دەیان چەنگە تف، دەیان شەق و زللە بە
پوولێك بوو ، خۆ جنێوو قسەی سوك ئەوە هەر باس
ناکرێ ...
بۆ ژوورێکیان بردو چاویان کردەوە ، نەیدەتوانی
باش ئەوانە لێك کاتەوە کە لەبەردەمیدا بوون ،
وای دەزانی لە پشت پەردەوە دەیانبینێ ، کەمێك
چاوەکانی هەڵگلۆفت و دوو کەسی دیت لە پشت
مێزێکەوە دانیشتبون ، ئەوەی لای ڕاست وورگ زلێکی
سمێڵ تاشراوی چارەگر ان ، دەمانچەیەك و کاغەز-
ێکی چاپکراوی لەبەردەم دابوو .. ئەوەی دیکە

ڕەشێکی لچ ئەستور، قەڵەم و کالەزێکی لەبەر دەستی بوو کەدیار بوو ئامادەی نوسینە . وێنەیەکی سەرکۆماری دیکتاتۆریش لە پشت سەریانەوە هەڵواسرابوو، لەبن ئەویشەوە نەخشەیەکی گەورەی نیشتمانی عەرەب بە دیوارەکەوەداکوترا- بوو، لەسوچێکی ژوورەکەشدا تەلەفزیۆنێك و دەزگا- یەکی ڤیدیۆ دانرابوو ...

کابرای وورگ ازل ڕووی لە شازاد کردو گووتی :-

- ناوت ...؟

- شازاد کەریم ...

- تەمەنت ...؟

- بیست و پێنج ساڵ ...

- پلەی خوێندن ...؟

- دەرچووی ئامۆژگای تەکنەلۆژیا ...

- باوکت ماوە ...؟

- بەڵێ ...

- ئیشی چی یە ...؟

- کرێکارە لە کارگەی جگەرە ...

( شازاد نەیدەزانی ئەم پرسیارانەی بۆ لێ دەکەن لەکاتێکدا پێ ی وابوو خۆیان زوربەی وەلامەکان

دەزانــــن ) ٠

ـ چەنـد بـرات هـەيـە ٠٠٠؟

ـ هيـچ بـرام نييە ٠٠٠

ـ چەند خـوشـكت هـەيە ٠٠٠؟

ـ سـێ ; شـلێرو شيرين و شەهلا ٠٠٠

ـ خـوشـكەكانت جـوانن ٠٠٠؟

( شازاد چاوی چوە پشـتی سـەری و لـە [illegible]ەتـان نەيزانی چی يان پێ بلێ و هـيـچ وەڵامی پێ نەدرايەوە ) ٠

كابرا لەسـەر قسـەكانی رۆشـت و گووتی :ـ

ـ هـا ٠٠٠ بۆچی وەڵام نادەيەوە ، واديارە ڕازی نيـت باسـی خوشكەكانت بكەين ٠ ئـەدی ژنت هێـناوە ٠٠٠؟

ـ نـــە ٠٠٠

ـ دەسـتگيرانيشت نيە ٠٠٠؟

ـ نـەخێـر نـيـمە ٠٠٠

كابرای وورگەزل كەمێك دەنگی بەرزتـر كـردەوە و بە هـەڕەشـەيـەكەوە گـووتی :ـ

ـ گـوێ بگـرە پـێـت بلێم ٠٠ چيـت لـێ دەپرسين ، چيت لـێ داوا دەكـەين ، بێ پێچ و پـەنـاو بەڕاسـتی وەڵامـان بـدەوە ٠٠ هـەرچـەنـدە ئـێمـە خـۆمان شـاگـامان لە هـەمـوو شـتێك هـەيە و دەسـتيشـمان دەگـاتە هەموو

جێ یەك ، هەروا هیچ کەسێ نی یە کە ئێمە نەیناسین وە ئاگامان لەهەڵس و کەوتی نەبێ ، نەزانین چ دەکا و خەریکی چی یە .. کەسیش لەبەر دەستمان قووتار نابێ ، بەڵام لە گەڵ ئەوانەشدا دەمانەوێ بەتالیبت بکەینەوە .

( ئازاد لەدڵی خۆیدا ، بیری کردەوەو خەریك بوو بڵێ: ئەگەر خۆتان هەموو شتێك دەزانن چ پێویست دەکا لەمن بپرسن . بەڵام نەیوێرا ئەم قسەیەبکات ) .

کابرا لە سەر قسەکانی رۆیشت و گووتی و-

- بە پێ ی ئەو زانیاریانەی ئێمە لە سەرتۆ دەستمان کەوتوە ، تۆ مرۆڤێکی گێرە شێوێنی لە گەڵ چەند کەسی دیکە دا کاری سیاسی دژ ی رژێم ئەنجام دەدەن ، بە چالاکی کاردەکەن و خەڵکی بۆ مەبەستی خوتان هان دەدەن و پرو پاگەندە ی ژەهراوی بلاودەکەنەوە . جەنابت بەرانبەر بەم قسانە چ دەڵێ ی ...؟

- دەلیم ئەم قسانە راست نین . ..!!

- ئەدی سەگباب ئێمە درۆ دەکەین ..!؟

- ( بە پەشۆکاویەکەوە ) .. نەخێر ، ببورە، مەبەستم ئەوەنەبوو کەبلێم خوانەخواستە جەنابتان درۆ دەکەن

بەڵکو مەبەستم ئەوەبوو .. ئەوەی ئەم هەواڵانەی پێ ڕاگەیاندون بە هەڵەدا چوە ..

- نەخێر بە هەڵە دا نەچوەو ئێمە بەڵگەی تەواومان لە سەرت هەیە ...

کاغەزە چاپکراوەکەی بەردەمی هەڵگرت و گووتی :-

- ئەم بەیاننامەیە دەبینی ..؟ بێ گومان دەیناسیەوە ئەمەمان لە ماڵی ئێوە دیتەوە ، پێمان بڵێ لەکێت وەرگرتوەو نیازت هەبوو بیدەی بە کێ ...؟

( شازاد زۆر شپرزە بوو ، هەرچەندی دەکرد نەیدەزانی چ بڵێ ، چاوەڕێ نەبوو هەروازوو بەڵگەیەکی شاوای لە سەر بدۆزنەوە ) .

نەڕاندی بەسەریدا :-

- جوان ڕاوەستە دایك حیز ... نازانی لە کوێ وەستاوی !!!؟

( ئەو زۆر ئاسایی وەستابوو ، نەیدەزانی چۆن ڕاوەستانێکیان دەوێ ، هەربۆ ئەوەی بەهانەیان ببڕێ کەمێك خۆی قیت کردەوە ... ) .

دووبارە نەڕاندیەوە بەسەری دا :-

- بۆ وەڵام نادەیەوە گوێت لی نەبوو چیم پێ گووتی ئەم بەیاننامەیەت لەکوێ بوە ..؟ دەتویست بیدەی بە کێ؟

- نیازم نەبوو بیدەم بەکەس ..

- ئەی باشە لەکێت وەر گرت ...؟

- لە کەسم وەرنەگرتوە .

- چۆن ئەی لە ئاسمانەوە باری !!!؟

( بەسەر ئیشارەتێکی بۆ ئەوانە کرد کەلە لا ی دەرگاکە وەستابون ، تاکو بیبەن ) .

هەر لە دەرگاکە چوە دەرێ ئەقێکی وایان تێ هەڵدا یەکسەر بەرەو دەم کەوت ، یەکێکیان لێ ی نزیک بووە ، وایزانی ڕاستی دەکاتەوە ، بەلاّم مشتە کوڵەیەکی سرەواندە لاشەوبلاکی وای زانی بە بۆکسی ئاسن لێ یان دا ، ڕاستیان کردەوەو بە پاڵ بۆ ژوورێکیان برد ...

یەکێکیان قیژاندی و گووتی :-

- یاللاّ خۆت ڕووت کەوە ...

- بۆچی خۆم ڕووت کەمەوە !!؟

پێویستی نەکرد وەلاّمی بدەنەوە ، بە هەمویان پەلاماریان داو جلیان لە بەردا نەهێشت ...

زۆری پێ عەیب بوو ، چونکە قەت لە بەردەمی خەلکیدا خۆی وا بە ڕووتی نەدیبوو .

لەسەر کورسیەك دایان نیشاند ، یەکێکیان

پارچە شاسنێکی بە دەستەوەگرت کە دەسکێکی تەختەی هەبوو ، بەوایەرێکەوە بەسترابوو شاسنەکەی ووردە ووردە لێ نزیك کردەوە تابە لێوبەو ە نوساند ، شازارێکی یەکجار ناخۆش هەموولەشی هەژاند ، بە هەموو هێزیەوە هلواری کرد ،( زانی کە تەزووی کارەبایە ) ، لێ یان کردەوە ئەوجا بە برۆیانەوە نوساند ... بە سینگیەوە ... بە رانی یەوە ... بە سمتی یەوە .. بە (......) بە... لەگەڵ هەموو تەزوویەك زەوی لەژێر پێ یدا دەلەرزی وای هەست دەکرد کە خوێن خەریکە لە ناو دەمارەکانی دا ووشك دەبن ... ئیدی توانای هاوار کردنی بڕاو بەرەبەرە ئاگای لەخۆی نەما ...

سەتڵێك ئاوی ساردیان پێ دا کرد ... بە هۆش خۆی هاتەوە بەڵام لەتاو ئازار هەموو گیانی هاواری دەکرد ، لە لایەکی دیکەشەوە وەختەبوو لە سەرمان ڕەق بێتەوە ، جلەکانی لەبەر کردەوەو هەربەپاڵە پەستۆ بۆ ژووری تەحقیقیان بردەوە .. زۆر بە زەحمەت خۆی بەسەر پێوە ڕادەگرت ، بە دەست خۆی نەبوو ئەژنۆکانی دەنوشتانەوە ، قسەی باش بو نەدەکرا دەتگوت تازە زمانی گرتوە ...

- ها ئێستا چۆنی ..؟ خۆت هەر بە شازا دەزانی یان عەقڵت هاتۆتەوە بەر خۆت ...؟

- چیە ... چیتان .... دە ..موێ .. ؟

دایانە قاقای پێکەنین و کابرا گووتی :-

- چۆن ئەوە بۆ واتان لەو بەستە زمانە کردوە ؟ بە راستی بەزەییم پێدا دێ یەوە ، بڵێ بزانم بەیاننامەکەت لەکێ وەرگرت و دەتویست بیدەی بەکێ ..؟

- نەمدەویست بیدەم بەکەس ..

نەپراندی :-

- بۆ خۆت لەبەشی یەکەمی پرسیارەکە دەدزیەوە پێم بڵێ لە کێت وەرگرت ..؟

( بیری کردەوە کەدەبێ درۆیەك ساز کا دەنا لە کۆڵی نابنەوە ) ..

- دۆزیمەوە ...

- دۆزیتەوە ..!!! چەند وەلامێکی شاسانە ، گوێت لێ بێ پێت بڵێم ، زۆری وەکو تۆ بە هەموو عەقڵی خۆیان ویستویانە ئێمە هەڵخەڵەتێنن ، یان خۆیان زۆر بە شلزا زانیوە ، بەلام سەرمان پێ شۆر کردون و دوایی ( .... ) یان پێ خوراوە ، جا تۆش نە ئەزیەتی ئێمە بدە و نەهی خۆت .. چی دەزانی پێمان بڵێ .. ئێمەش

چی داوا دەکەی و پێویستت بە چی بە بۆت ئامادە دەکەین ...

- ئامادەم ئەوی بمزانم پێتان بڵێم ..

- ئافەرین کوڕی عاقڵ ، من هەر دەمزانی ژیرو هۆشیار ی چونکە منجری لە تۆ نەدەوەشایەوە ، دەترسم ئەزیەتیشیان دابی . ئێستا بڵێ بزانم بەیاننامەکەت لە کێ وەرگرت ..؟

( دیسان بیری کردەوە کە دەبێ درۆیەکی چاترلەهی جاری پێشوو ساز کا کە بڕێك ڕێ ی تێ بچێ) .

- بەیانیەکیان زوو لە ماڵێ هاتمە دەرێ دیتم لە بەر دەرگای دەرەوەمان فڕێ درابوو ، منیش هەڵم گرتەوە ..

- باشە بۆ ، بۆ ئێمەت نەهێناو ئاگادارت نەکردین ؟ جگە لەوە مەبەستت لەهەڵگرتنی و هێشتنەوەی لای خۆت چی بوو ..؟

- ڕاستیەکەی ئەم زانی پێویست بەوە دەکا ئاگاداری ئێوەبکەم ، هیچ مەبەستێکیشم لە هەڵگرتنی نەبوو، بەلام کاتێك هەڵم گرتەوە ، بردمە ژوورەکەی خۆم دام نا، ئیدی پاشان لە بیرم چووە ..

کابرا کەمێك ڕاوەستا وەك بڵێی بیر لە شتێك دەکاتەوە ، پاشان گووتی :-

- باشە قەیناکا دوایی دێینەوە سەر ئەو باسە،
بەڵام دەمانەوێ شتێکی دیکەمان پێ بڵێی ، دەمانەوێ
جێگاو شوێنی ئەو هاوڕێ بیانەتمان پێ بڵێی کە
ئیشت لە گەڵیان دەکرد ..
- نازانم مەبەستتان کێیە ..!!
- مەبەستمان لەوانەیە کەبەیەکەوە ئیشتان دەکرد.
- چ ئیشێك ...؟
- نازانی چ ئیشێك ..!! خۆت گێل مەکە ئەو ئیشە ی کە
ناوتان لێ ناوە خەبات ..
- من هەرگیز ئیشێکم نەکردوە بۆنی شتی وای لێ بێ
هەروا هیچ کەسێکیش ناناسم کەبەشتی وا هەستابێ
- ئەدی باشە کە بەبەڵگە سەلماندمان چ دەڵێی ..؟
- پێم وانی بە بتوانن شتێك بسەلمێنن کە نەمکردوە ..
زەنگێکی لی داو گووتی :-
- فەرهاد عەلی بێنن ..
( شازاد بە بیستنی ناوی فەرهاد دڵی داخوریا،لە دڵی
خۆیدا دەیگوت باشە ئەگەر بێت و فەرهاد هەرچی هەیەو
نیە ئیستا لەبەر دەمی ئەودا بیڵی ئیدی ئەو چۆن دەتوانێ
نکوڵی بکاو خوی لێ لادا . بەڵام هەرخۆی بەخۆی دەگوت :-
نا فەرهاد شتی وا ناکا ؛ ئەگەر پێش ئێستا شتێکی

لە ژێر ئەشکەنجەدا درکاندبێ ، لەبەر دەمی ئەودا لێ ی پەشیمان دەبێتەوە ، فەرهاد شازا- یەتی و خۆڕاگری فێری هەموان دەکرد، ئێستاچۆن ڕووی دێ بەرامبەر ئەو خۆی بەدرۆ بخاتەوە .. )

هێندەی پێ نەچو هێنایان ، سەری لەبەر خۆی نابو بەرزی نەدەکردەوە .

کابرای وورگ زل ڕووی تێ کردو گووتی :-

- تۆ ئەو کوڕە دەناسی ..؟

کەمێک سەری بەرز کردەوەو بۆ یەك چرکە چاوی بە شازاد کەوت و سەری نایەوە بەر خۆی.

پاشان کە بە ئاستەم دەنگی دەهاتە دەرێ گووتی :-

- بەڵێ ..

- ناوی چی یە ..؟

- شازاد کەریم ..

- چۆنی دەناسی ...؟

کەمێک بێ دەنگ ڕاوەستا پاشان گووتی :-

- پێکەوە لە یەك ڕێکخراودا ئیشمان دەکرد...

- ئەدی ئەوانەی دیکە کە لە گەڵتان بوون ناویان چی یە .. ؟

- بۆ خۆم لێ پرسراویان بووم ، جەنگی جەلال

ياريده دەرم بوو ، ئەوانی دیکەش ، بەختیار حاجی سلێمان میرزا ، عەزیز کاکەمین کەیێ یان دەگووت عەزە چلوشین ..

شازاد چاوەکانی لێك کردبوونەوە ، بەرامبەر بە قسەکانی فەرهاد حەپەسابوو ، هەرچەندی دەکرد نەیدەتوانی بەخۆی بسەلمێنی کە ئەوەی بەرامبەری راوەستاوە ئەو هاوڕێ خۆشەویستەیەتی کە رێگای راستی بەو ناساند . لە خۆی دەپرسی ( چۆن مرۆڤ لەماوەی یەك دوو ڕۆژدا شاوا دەگۆڕێ و لە مرۆڤێکی پاك و بێ گەردەوە دەبێتە خاشێنێکی دەروون پیس ..!؟ چۆن بە ئەشکەنجەی تەنیا دوو ڕۆژ ویژدان و پیاوەتی و بیرو باوەڕ سڕدرانەوە !!؟ بەڕاستی سەیرە ! ).

بە ڕقێکەوە هاواری کرد :-

- نەخێر .. باوەڕی پێ مەکەن .. درۆزنە ... ناپیاوە .. بێ ویژدانە ...

کابرا نەڕاندی :-

- دەنگ بەرز مەکەوە هەی سەگباب .. تەماشای کە چەندە بێ چاوو ڕوویە ، بەرامبەر کورە حاشا دەکا ؟ وەرن بیبەن ، بەلام فێری کەن چۆن قسان بکا ...

ئەمجارەیان بۆ ژوورێکیان برد کەهاوارو نالەیەکی

زۆر دەهاتە بەر گوێ ی ، لەناویاندا دەنگی ئافرەـ
تیشی دەبیست ، بەلام کەسی نەدەدیت ، شازاد بە
بیستنی ئەم دەنگانە دڵی دەگوشراو ئازاری دەچەشت ،
لەدڵی خۆیدا دەیگووت ئەم جارەیان کلرەبام لی نەدەن
ئیدی چیم لی دەکەن با بیکەن •

جاری پێشوو هێندەی ئازار چەشتبوو ، پێ ی وابوو
ئەگەر جارێکی دی وای لی بکەنەوە ئیدی هەناسەی پێدا
نایەتەوە •

لە سەر میزێکی درێژ پالیان خست ، هەموو لەشیا ن
توند بە مێزیکەوە بەستەوە ، نەعلەکانیان لەپێ
داکەندو بە کێبلێ بەربونە کوتانی بەری پێ ی •••••
تا سێ چوارێکی هەرخۆش بوو ، بەلام بەرە بەرەوای لێ
هات کە پێ ی وابوو کێبلەکە بەری پێ ی دەسمێ و
دیوار دیو دەبێ • چەندی دەیویست دان بەخۆیدا
بگرێ و هاوار نەکا ، بەلام خۆی بۆ نەدەگیراو
لە گەڵ هەموو لێدانێك هاوارێکی بەهێز لە
سینگیەوە دەهاتە دەرێ ••• ئارەزووی دەکرد لەو
کاتەدا بمرێت چونکە پێ ی وابوو مردن لە ژیانێکی
پڕ لە ئازار خۆشترە •

کاتێك ڕاستیان کردەوە نەیدەتوانی لاق لە
سەر زەوی دانێ ، دەبویست بە گاگۆڵکە بڕوا
بەلاّم بە زۆر ناچاریان کرد بە سەر ئەو ووردە
بەردانەدا بڕوا کە وا دیار بە تایبەتی بۆ
ئەو مەبەستەیان لەوێ ڕۆ کردبوو . شازاد
پێ ی وابوو ئەو ووردە بەردانە بزمارن و بە بەر ی
پێ ی دا دەچنە خوارێ و ئەمە ش خۆی لە خۆی دا ئەـ
شکەنجەیەکی دیکە بوو .

دەرگایەکیان کردەوەو بەچوار دەستەکی
فڕێ یان دایە ژوور ڕێ..

ژوورێك لە ژێر زەمین دەچوو ، ئەگەر بتویستایە
هەستیە سەر پێ ، دەبوو خۆت بچەمێنیەوە دەنا
سەرت بەبن میچەکە دەکەوت . ئەوەی یەکەم جار
چوبایە ژووری هیچی نەدەدی ، چونکە لە کونێکی
چوار گوشە کە لە دەرگاکە کرابوو کەلێنیکی
دیکەی تێدا نەبوو تا ڕوناکایی پێدا بێتە ژوور ێ ..
جگە لەو پەتوە ڕەشە تەنکانەش کە بەیەك قەد
کاشی ژوورەکەی پێ داپوشرابوو ، هیچ ڕایەخێکی
دیکە بەر چاو نەدەکەوت . ژوورەکە بۆ خۆی جیگای
- ٣٠ - کەس دەبووە ، بەلاّم زیاتر لە - ٥٠ - کەسیان

تێ شاخنیبوو .

شازاد لە ناو شازاری گیانی هیچ شتێکی لە بیر نەمابوو ، بە دەست خۆی نەبوو فرمێسکەکانی هۆن هۆن دەهاتنە خوارێ و بە شازارەوە دەتلایەوە ، هەستی دەکرد دەستەکانی زۆر بێ هێزو لاواز بوو ن تەنانەت توانای ئەوەیان نەبوو ئەو شوێنانەی پێ بشێلێ کە شازاریان هەبوو ...

هەستی کرد دەستێك شانی دەگرێ و دەیەوێ هەڵی بستێنێ ..

- دەزانم زۆرت شازار هەیە ، وەرە بالای خۆمەوە جێ یەکت بۆ بکەمەوە ، بەڵکو کەمێك بحەسێ یەوە ، هەرچەندە ئێرە شوێنی حەسانەوە نیە ...

ئەو دەنگە بەلای شازادەوە زۆر بەسۆز بوو ، زۆ ر کاری گەر بوو ، چاوی هەڵبری لاوێکی سەرو ریش هاتو ، چڵکن ، لەرو لاوازو بەچەند ساڵێك لە خۆی گەورەتری هاتە بەر چاو ، تینی دایە خۆی ، بە خۆ خشاندن و بە یارمەتی ئەو توانی خوی بگەیەنێتە تەنیشتی دیوارەکە .

- ئێستا دەتوانی کەمێك لاق ڕاکێشی و پاش ماوەیەك دێ بەوەسەر خۆت ...

شازاد چاوەکانی لەسەر یەکدانان ، دیار بوو خەوی لێ نەدەکەوت ، بەڵام بەو جۆرە هەستی بە حەسانەوە دەکرد ، تاوێک شاوا ملیەوەو برێک هاتەوە سەر خۆی ، هەرچەندە پێ ی وابوو بەری پێ ی دەرزی شلۆن دەکەن ...

لاوەکەی تەنیشتی سەرێکی لێ نزیک کردەوەو گووتی :-

- کاکە گیان ببورە ناویشت نازانم ئێستا چۆنی ..؟

- ناوم شازادە ، برێکیش باشترم ، سوپاست دەکەم ..

بێ گومان باش دەبی ، بەڵام دەبێ وورەت بەرز بێو باوەڕت بە خۆت بێت ..ئەوەی لەم ژوورە دەیانبینی هەمووی لە تۆ خراپتری دیوە ....

- باوەڕم بە خۆمەو وورەشم بەرزە ...

- زۆر باشە ، دەبێ تا سەریش هەر شاوا بمێنیەوە ..

- بێ گومان هەروا دەبم ..

هەردوولایان کەمێک بی دەنگ بوون پاشان شازادگووتی:-

- برادەر تۆلەمنت پرسی ناوم چی یە بەڵام ناوی خۆت پێ نەگووتم ..

- ناوم خالیدە ..

- کاک خالید وابێ دەچێ لە مێژ بێ گیرابی ..!!

- سێ مانگ و دە عەوە ..

- لەسەر چی گرتیانی ..؟

- کاکە شازاد پێویستە بزانی لە سەر چی گرتویانم تۆیان بە چ گوناهێك گرتوە منیش هەروا ، لە وڵاتی ئێمەدا پیاو کوژو ئینسانی ساختە چی و ، دزو جەردە ، دەستی بۆ ئابڕێ و ئازادە ... بەڵام ئینسانی باش و ئیشتمان پەروەرو دڵسۆز دەگیرێ و ئازار دەدرێ و ئیعدام دەکرێ ..

دەیانەوێ ویژدان و بیرو باوەڕەکەت لەدەست بدەیت ، دەیانەوێ ئینسانیەتو پیاوەتی و شەرەف لە دەرونتدا نەهێڵن ، وات لێ دەکەن قینت لە هەموو کەس بێتەوەو خەڵکی بەرەو مردن بەری ، جاسوسی لەسەر باب و برای خۆت بکەی . بەڵام ژیانی هەمیشەیی بۆ کەس نەنوسراوە ، مرۆڤ هەردەمرێت جا کە هەر مردن بێت با مردنێکی شەرەفمەندانەو لە پێناو بەختیاری کەسانی دیکەدا بێ ، چەند خۆشە ئینسان بمرێت و دڵنیا بێ لەوەی شتێکی پێشکەشی گەلەکەی کردوە و دوای مردنی بە ڕێزەوە ناوی دێنن ، نازانم قسەی ئەو مامۆستایەت گوێ لێبوە یان نا کەلەبەر دەم سیدارەدا گووتبوی پێیان

خۆشە بەلام مردن لە پێناوی ژیاندا خۆشترە ..)
مرۆڤ نابێ لەو ڕێگایەی هەڵی دەبژێری دوودڵ بێ نابێ
لە بڕیاری ڕاست و دروست پەشیمان بێتەوە، بڕیاری
ڕاستی ئێمە ئەوەیە کە دەبێ سەر شۆڕ نەکەین،
ئازا بین، وەك ئە و تێکۆشەرەی کاتێك چاویان هەڵکۆڵیو
دایانە دەستی گووتی:ـ ( ئەمە بچوکترین دیاریە
پیشکەشی گەلەکەمی دەکەم ..) . ئەو تێکۆشەرە
باوەڕی بەڕاستی ئەو ڕێگایەی لەسەری بوو بێ
سنور بوو ، هیوای بە سەرکەوتنی مەسەلەی
ڕەوای گەلەکەی پۆڵاین بوو، ویژدان لای ئەو پیرۆز
بوو بۆیە پاراستی و نەیهێشت لەکەداربێ .
( ئلزاد زۆر باش گوێ ی لە قسەکانی گرتبوو زۆر
بەلایەوە خۆش بوون، تەواو باوەڕی پێ یان بوو بەلام
کە سەرنجی قسەکانی دا زانی خالید لەوەی دەیلێ
مەبەستی تەنیا وەلامدانەوەی پرسیارەکەی ئەو نیە
بەڵکو دەیەوێ بەم بۆنەیەوە هەندێك شتی بۆ ڕوو ن
بکاتەوە ) .
خالید زیاتر لەسەر قسەکانی ڕۆیشت و گووتی:ـ
ـ مرۆڤ نابێ هەرگیز هیوای لەدەست بدا ، بەڵکو تا ئەو
کاتەی کە دوا هەناسەی لەسنگدایە دەبێ دلی بە ژیان

خۆش بوێت و لە تێکۆشان سارد نەبێتەوە، چونکە بێ هیوایی دوژمنی سەرسەختی شێنسانە، وورەو باوەر کەم دەکاتەوە، شێنسان بیرو هۆشی لە دەست خۆی دا نامێنێ و، نازانێ چۆن هەڵس و کەوت بکات .

شازاد لە دڵەوە بوو بە ناشنای خالیدو خۆشی ویست، بە قسەکانی وورەی بەرزتر دەبۆوەو هەستی بە نارامی دەکرد، زۆر نارەزووی دەکرد باشتر بیناسێ و زیاتر شتی لێوە فێر بێ .

پێ رانەگەیشتن زیاتر درێژە بە قسەکانیان بدەن نەمنێك دەرگاکەی کردەوەو گووتی:-

- نانە کەتان بە دەرد کەن ..

شازاد نان خواردنی بیر چوبۆوە؛ هەرچەند زۆریشی برسی بوو بەلام نارەزووی هیچ خواردنێکی نەدەکرد لەوەش دەترسا نیوەرۆ هەمان نانی بەیانی بۆ بێننەوە کە لە بەر چاوی بە تف و بەلغەم سواخیان دا ....

رووی لە خالید کردو گووتی:-

- نیوەرۆچمان دەدەنێ بیخۆین ....؟

- ( بە بزەیەکەوە ) هەرچی دایانێنێ دەبێ بیخۆی دەنا لە برسان دەمری، هەرئەوەیە کە دەمانهێنێ ئەگەر نەیخۆی چی دیکەت دەست ناکەوێ، جا پلن سەمونە رەلە

که به شاو نەرمی دەکەینەوە ، یان ئەگەر خوایکا بۆ خۆیان شتێکیان لەبەریمێنیتەوە ، ئەوا بەرماوەکەی خۆیانمان دەدەنێ جا ئەویش خوا دەزانی بەر ئێمە دەکەوێ یان نا ...

تازە ئەوەیان خواردبوو کە ناویان لێ نابوو نانی نیوەڕۆ .. لە پڕ دەرگاکە کرایەوە ئەمنێك هلتە ژوورێ و شازاد ڕاچڵەکی و وایزانی هاتوون ئەو ببەنەوە،ئەمنەکە بەرقییەکەوە بانگی کرد :-

- هێرش قادر ..

( کوڕێك کە تەمەنی لە - ١٢ - ساڵ تێ نەدەپەڕی هەر لە نزیکی دەرگاکەوە دانیشتبوو هەستایە سەر پێ ڕەنگی تەواو لەبەر بڕابوو هەموو لەشی لە ترسان هەڵدەلەرزی ، زۆر باش خۆی بە سەر پێشەوە ڕانەدەگرت ... ئەوانەی کەلە ژوورەکە بون چاویان تێ بریبوو، دەیانویست دەم و چاوی بخوێننەوە داخوا لە چ وەزعێك دایە .. ئەمنەکە پەلی گرت و ڕای کێشایە دەرێ ..

شازاد کە چاوی بە کوڕەکە کەوت یەکسەر ڕووی لە خالید کردو گوتی -

- ئەو منداڵە بۆ کوێ دەبەن ...؟

- دیارە بۆ تەحقیقی دەبەن ...

- لەوەش دەدەن ....!!؟

- بێ گومانم لێ ی دەدەن ..

- باشە ئەوە چی کردوە لە سەر چی گیراوە ؟.

- ئەوە ... چون ویستویانە بابی بگرن ، بەلاّم لە ماڵێ نەبوە ووەبەردەستیان نەکەوتوە ،ئیدی لە جیاتی بابی ئەویان گرتوە ..

- ئاخر پێم بڵێ چ یاسایەك ریگای ئەو شتە دەدات کە کور لەجیاتی بابی بگیرێ ، بە تایبەتی منداڵێکی ئاوا ..؟

- یاسای چی کاکە ئازاد .. وادیارە هێشتا ماوتە ئەوانە باش بناسی . من و تۆیان بەچ یاسایەك هێناوەتە ئێرە ئەویش هەر بە هەمان یاسا ، ئەو خەڵکە بەچ یاسایەك دەگیرێ و ئیعدام دەکرێ، ئەویش هەر بە هەمان یاسا .

- باشە ئاخر بۆ ئاویش بێ دەبێ شەرعیەتێك بدەنە ئەو کارەی دەیکەن .

- بەڵێ .. زۆر ئاسانە ، پێش هەموو شتێك بە ئارەزوو بەپێی بەرژەوەندی خۆیان، یاسایەك لادەبەن و هی دیکەی لە جێ دادەنێن ، پاشان ئەگەر بیانەوێ

منداڵێکی شاواڵە سێدارە بدەن ، دیارە پاشا بەدەست خۆیانە ، زۆر بە ئاسانی تەمەنی دەکەن بە - ١٨ - ساڵ ، هەرکەسێکیش حوکم بدەن کاغەزێکی پێ ئیمزا دەکەن کە بە شارەزووی خۆیان پڕی دەکەنەوە ، خۆ ئەگەر یەکێکی نەشارەزا لەوە بێ و بیخوێنێتەوە دەڵێ ( بەڕاستی ئەم حوکمە پڕ بە پێستیەتی ) . بەم شێوەیە شەرعیەت بە خۆیان دەدەن ...

وەکو چۆن من بە دەستی خۆم ئەو هەموو تاوانانەم ئیمزا کرد کە بە ناهەق دایانە پاڵم و بۆ خۆم شەرعیەتم دانێ کە تاوانبارم کەن ...

- چ تاوانێکیان دایە پاڵت ..؟

- ئەوەی لە هەموو شت خراپترەو هەرگیز بە بیرمدا نەهاتوە .

- ئەدی کەوایە بۆچی ئیمزات کرد ..؟

- ( هەناسەیەکی هەڵکێشا ) ، بۆچی ئیمزام کرد؟ ترسنۆکی هاوڕێ کانم و دڕندەیی ئەوانە وایان لێ کردم ئیمزای کەم .

- چۆن ..؟

کەمێک بێ دەنگ بوو وەک بیەوێ بیر لە شتێک

بكاتەوە ، پاشان گووتی :-

- تەواو سێ مانگ و دە شەو پێش ئێستا ، لە گەل (٧) هاورێم بەیەکەوە گیراین ، ئەوانەی لە گەڵمـدا بوون تەنیا چوار ڕۆژ خۆیان گرت، پاشان هەموویان ئیعتیرافیان کرد ، جاچ لە سەر خۆیان چلە سەر من چ لە سەر ئەوانەش کە دەمانناسین ، خۆ ئەگەر بهاتباو چەند ڕۆژی دیکە خۆیان ڕاگرتباو قسەیان نەکردایە وامان لێ بەسەر نەدەهات وبە چەند ساڵێکی کەم حوکم دەدراین ، لێرەش ئەوەی بە چەند ساڵێك حوکم لێ ی خوش بن ، دەبێ وای دابنێ کە ئازاد کراوە ..

منیان بە تەنیا لە ژوورێك بەند کردبوو ئەوانی دیش هەموو پێکەوەبوون ئیدی مەگەر لە ژووری تەحقیق دەنا چاوم پێ یان نەدەکەوت .

ڕۆژێکیان بۆژووری تەحقیقیان بردم ، تەماشام کرد یەکێك لە برادەرەکانم قاتێك جلی تازەی لەبەربوو پاك و خاوین ، ریش تاشراو ، لەسەرووی هەمویانەوە لە سەر کورسیەك دانیشتبوو ، تێ نەدەگەیشتم ئەمە چ بەزمێکە .. ئیدی یەکسەر برادەرەکەم دەستی بە قسە کردن کرد ، ڕووی تی کردم و بە فیزێکەوە گووتی ( گوێت لی بێ خالید ، ئیمە هەمومان ئیعتیرافمان کردوە ،

چونکە بەڕاستی ئەوە ناهێنی خۆمان بە لێدانو کوتان
بدەین ، بۆ کێ ی بکەین ، بەڵێنیشیان داومێ کە
بمکەن بە وەزیر و برادەرەکانی دیکەشمان هەریەکە لە
سەر ئیشێکی باش دادامەزرینن ، تەنیا تۆ ماوی ئەگەر
تۆش ئیعتیراف بکەی شتێکی وادەکەم هە چ پێویستیەکت
هەبێ بۆت جێ بەجێ کەن و لە سەر چ ئیشێکی باشیش
دەڵێ ی دات دەمەزرێنن ...)[1]

ڕاستیەکەی پێم وابوو ئەو برادەرەم شێت بووە ،
نازانم چۆن ئاوا هەڵیان خەڵەتاندبوو ، بەچ عەقڵێکەوە
باوەری بەم درۆو دەلەسانە کردبوو . لەلایەکەوە
ڕقم لێ ی هەستابوو قەستم دەکرد پەلاماری دەمو بی -
خنکێنم ، لە لایەکی دیکەشەوە بەزەیم پێ ی دا دەهاتەوە
ئارەزووم دەکردکە بمتوانیایە وەڵامی بدەمەوەو چیم لە
دڵدا هەیە پێ ی بڵێم ، بەڵام لەبەر چاوی ئەوان نەمدەویرا
هیچ بڵێم .

ئەوەی کەدەیانویست لە برادەرەکانم دەستیان کەوتبو
بەڵام زۆر مەبەستیان بوو کەمنیش دان بەو شتانەدا بنێم
کە ئەوان گووتویانەو بڵێم ڕاستە ، منیش نەمدەویست
ئەم کارە بکەم چونکە لەلایەکەوە دەمویست بە تەنێ
بەرامبەریان ڕاوەستم و بڵێم درۆدەکەن بەتایبەتی لە

لەسەر ئەو شتانە پێم دادەگرت و دەمویست بە درۆیان بخەمەوە کە پەیوەندیان بەوکەسانەوە هەبوو کە هێشتا دەستگیر نەکرابوون . لەلایەکی دیکەوە دان پێدا نانم بە قسەکانی ئەواندا مانای تیداچوونی خۆمە، چونکە دەمزانی ئەوەی من کردبوم بە پێی هەڵسەنگاندنی ئەوان ، بەس بوو بە ئەوەی بێ سێ و دوو حوکمی خنکاندنم بەسەردا بدەن ، پێشتریش بیستبوم کە ئینسان بە دەمی خۆی ئیعتیراف نەکا لەوانەیە رزگاری بێ ، تەنانەت لەسەر دیواری ئەو ژوورەی منی تێدا بەند کرابووم نوسینێك هەڵکەندرابوو ( ئیعتیراف مەکە بەردەبی ) ، دیارە من دەمزانی بەشی هێندەیان شت لە سەرمن دۆزیوەتەوە کە بەرم نەدەن ، بەلاّم لە ئێشتام هەر باشتر بوو .

ئەوەی ویستیان لەگەڵیان کردم ، بەلاّم هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە کە دەتوانن بە قسەم بێنن . هەرلەکارەباوفەلاقەو هەڵواسین بە پانکەو سەرخستنە ژیر دڵۆپی ئاوو ......

- سەرخستنە ژیر دلۆپی ئاو چونە ؟!!!

- دەتوانم بڵێم یەکێکە لە ئەشکەنجە هەرە ناخۆشەکان . دێنن... ئاو چاوانت دەخەنەژیر ئاویکی

سارد كە دڵۆپ دڵۆپ دێتە خوارێ ، سەرەتا وادەزانی ئەگەر تا سبەینێ درێژە بكێشێ باكت نابێ ، بەلاّم پاش چەند دەقیقەیەك وات لێدێ پێت وایە بەچەكوشی ئاسن بەسەرسەرت دادەدەن و دەڵێی ئێستا نا ئێستا مێشكم دەتەقێ .. ئیدی چەندی هاوار كەی چەندی خۆت راپسكێوی بەستراویەوەو كەسیش بە دەنگتەوە نایە .

یان دەیان بردمە بەر گڵۆپێك ، تیشكەكەی هێندە بەتین بوو ، ئەگەرچاویشت بنوقاندایە هێشتا وات دەزانی چەقۆیەو بەناو چاوانت دا دەچێتە خوارێ .

ڕۆژێكیان بردیانمە ژوورێك كە تابڵێی ئەو ژوورە جوان ڕازابووە ، هەرلەدەرگاوە بۆنو بەرامێكی هێجگار خۆش بە لووتم دا هات ، مێزێكی گەورە لە ناوەڕاستی ژوورەكە دانرابوو ، ئەوەی بیر ت بۆی ناچێ لە خواردن و خواردنەوەی خۆش لە سەری دانرابوو ، چەندان ئینجانە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگ ژوورەكەیان هێندەی دیكە جوان كردبوو ، خۆ جوانی و ڕازاوەیی ئەرزو دیوارو پەردە پەنجەرەكان ، هەر خوا بزانێ چۆن بوو ، كچێكی

ئاوا بیست سالانەش کە بە جوانترین شێوە شارابش کرابوو ، کراسێکی تەنکی لەبەردابوو کە لە ژێرەوە هەموو گیانی دیاربوو ، بە نەرمی لەگەڵ ئاوازی موسیقایەکی زۆر خۆش بەبەردەمدا دەهات و دەچوو سەمای دەکرد .
پێی یان گووتم :-
- باش سەیری کەو لێی ووردبەوە ..
منیش نەمدەزانی ئەنجامەکەی چی دەبێ و مەبەستیان لەم کارە چییە !! بەلام پێم نەبوو ئەو جێ یە بەجێ بێڵم و لە تەماشا کردنی تێر نەدەبووم .
پاش چەند دەقیقەیەك لەوێ یان لابردم و بۆ ژوورێکی دیکەیان بردم کە چەند هەنگاوێك لەوێوە دوور بوو ، بەلام چی ببینم ...!!! ئەوەی کە یەکەم جار بەر چاوم کەوت مرۆڤێکی مردوو بوو کە لە ناوەڕاستی ژوورەکە درێژ کرابوو ، سەرەتا گوتم ڕەنگێ ئەمە ناپلۆن بێو بیانەوی منی پێ بترسێنن ، بەلام کە لێی نزیك بوومەوە بۆم دەرکەوت کەهی ڕاستیە . چاوی هەڵکۆڵرابوو .. گوێ و لوت و لێوەکانی و ( ...و... ) بڕدرابوون .. پەنجە-

کانی دەست و لاقی شەنجن شەنجن کرابون .. بەیەکێکیش بە زنجیرێکەوە هەڵواسرابوو کە سەری زنجیرەکە قولابەیەکی پێوە بوو لە قورقوڕاگەی هەڵچەقیبوو .. جگە لەوانە چەندان دەست و پێی براوو کاسەی سەرو ددان و نینۆکو شتی دیکەی لەم بابەتەی تێدا بوو ، سەرەڕای ئەوە دەنگێکی هیجگار ترسناك کەگریانو هاوارو نالە بوو دەهلتە بەر گوێم ، کە پێم وابێ لەسە شریت تۆمار کرابوو .

ڕاستیەکەی سامێکی وا بەسەرمدا هات کەئیدی نەمتوانی چیدی تەماشای کەم .. دڵنیام زیاتر لەوەی ئێستا بۆت دەگێڕمەوەشتی لێ بوو ، بەلام لە توانام دا نەبوو لەوە زیاتر لە ژوورەکە ووردببمەوە .

گووتیان :-

- باش لەمەش وورد بەوە ..

پاشان بۆ ژووری تەحقیقیان بردمەوەوگووتیان :-

- هەردوو ژورەکەت بەچاوی خۆت دیت ...؟

گووتم :-

- بەڵێ دیتم ..

گووتیان :-

- بلێ بزانین ئێستا کامەیان هەڵدەبژێری ؟..

کەوایان گووت لە مەبەستیان گەیشتم ئەگەر بمگوتبایە زووری یەکەمیان ، دەیانگووت دەکەواتە بەرامبەربەوە چی دەزانی پێمان بلێ و چیمان بوی دەبێ بومان بکەی ....، راستیەکەی هەر زوو گەیشتمە ئەو بڕیارەی کە نەلێم زووری یەکەمیانم دەوێ ، بەلام هەرچەندیشم دەکرد بەزارمدا نەدەهات بلێم ، ئەوەی دووەمیان ، چونکە ترس و سامێکی وام لێ نیشتبوو کە لە ژیانم دا بە خۆمەوە نەدیبوو . خۆئەگەر بمزانیبا یەکەردەمکووژن بڕوات هەبێ بێ سێو دوو ئەوەی دووەمیانم هەڵدە - بژارد ، بەلام زۆر دەترسام پێش کوشتنم پەل پەلم کەن و چاوم هەڵکوڵنو دەم و لوتم ببڕن ..لە بیر کردنەوەدابووم گووتیان :-

- چیت گووت وەلاممان بدەوە ؟..

گووتم :-

- ناکرێ هیچیان هەڵنەبژێرم ؟..

- نەخێر نێرکە کاردوو نیت لەو ناوەراستەدا شین بی ..

گووتم:-

- هی یەکەمیانم ناوێ ..

گـــووتـيـان :ـ

ـ هـەڵكـەر ، دەبـەنگە ، بـێ مێشـك ...

بردمیانەدەرێ .. ئەمجارەیان پێم وابێ یەكێكی لەمن گرنگتریان دەست كەوتبوو ، چونكە لەجیاتی بۆ ژوورەكەی خۆم بیەنەوە كەبەتەنێ لەوێبووم بۆ ژوورێكی دیكەیان بردم كەوەك ئێرە وابوو نزیكەی (٤٠) كەسی تێدا بوو ، لەوێش وەزعێكی زۆر ناخۆشمان هەبوو ، هەردەقیقەیەك بەسالێك دەرۆیشت ، كەم ئەو هەبوو كەدووسێیەك نەبەنەدەرێ و گوولله بارانی نەكەن ، جا هەموو جارێ كەكابرای ئەمن بەدوای ئەو كەسەدا دەهات كە دەیانویست گوللە بارانی كەن ، هەرلەدوورەوە قیتویەكی بۆ لێ دەداو بەدەست ئیشارەتێكی بۆ دەكرد تاپێتە دەری ، ئیدی هەر كەسێكیان بەو جۆرە بانگ بكردایە یەكسەر دەمانزانی بۆ مردنە .

ئەوێكیان لەنەكاو دیتم ئەمنێك هاتە ژوورێ و هەر لە دەرگاكەوەبەو شێوەیە قیتویەكی لێ داو بەدەست ئیشارەتێكی بۆ كردم ڕاستیەكەی حالەتێكی وام بەسەردا هات كە بەزۆر هەستامە سەر پێ كاتێكیش هەستام ئەژنۆم لەدوا نەدەهات دڵم بە

جۆرێك لێ ی دەدا دەمگوت شێتتا دەپچڕێ ، هەناسەم نەدەهاتەدەرێ ، دەتگووت یەكێك دەستی لە بینە قاقا م ناوە ... هەرچۆنێك بێ بۆ دەرێیان بردم ولەگەڵ نزیكەی (١٠) كەسی دیكە لەحەوشەیەكی گەورە كۆیان كردینەوە ئەوجا دەستی هەموانیان لەپشتەوە بەستینەوە ..چەند دارێك لەوی چەقێندرابون ، هەریەكەمانیان بەپاڵ دارێكەوە وەستاند ، پاشان شیشێكی ئاسن كە بە شێوەی بازنەیی بوو بەناو قەدمانیاندا هێنایەوە كەهەردووسەری شیشەكە لە پشتمانەوە بە دارەكەوە بەسترابوو .. ..... بەرامبەر هەریەكێك لە ئێمە تفەنگ بە دەستێك كەبۆ تەقە كردن ئامادەبوو راوەستا ، یەكێكیش كە دیاربوو فەرماندەیانە لەو سەرەوە راوەستابوو . پێشتر بیستبوم ئەوانەی گوللە باران دەكرێن چاویان دەبەستن كەچی نازانم ئەو شەوە بۆ چاوی مەیان نەبەست .

هێندەی پێ نەچوو فەرماندەكەیان هاواریكرد (أرمی)* ... ئیدی جوان چاوم لە تفەنگەكان بوو كە ئاگر لە لولەكانیانەوە بەرەورووی ئێمە دەر دە پەرین

---

* ووشەیەكی عەرەبیە ، بەواتای ( بی تەقێنە ) یان ( بیهاوێ ) دێت .

... زۆر باش چاوم لەوانەی ڕاست و چەپم بوو کە سارد دەبونەوەو بەلادا دەهاتن ، بەڵام ئەو شیشەی کە بە ناوقەدیاندا هاتبوّوە نەیدەهێشت بەربنەوەو بکەونە سەر ئەرزی ، گوێم لە زیکە زیکی گوللە بوو کە بە بنا گوی ی منیشدا دەهاتن ، بەڵام هەستم نەکرد هیچ گوللەیەکم پێ بکەوێ ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا بەدەست خۆم نەبوو وەکو ئەوان ئەژنۆم شل بوو بەلادا هاتم .. هێندەی پێ نەچوو یەکێك هات ڕاستی کردمەوەو گووتی :-

- هەستە خۆت مەمرێنە تۆ بە ئیعدام مەحکوم نی ..!

ئیدی من نەمدەزانی ئەوەچی بە دەیبینم !!! خەونە ، فیلمە ، یان شتیکی دیکەیە ...!!! !

سەرەتا وام زانی ئەوانی دیکەش هەروەکوو منن و هیچ گوللەیان پێ نەکەوتوە ، بەلام کە لێ یان وورد بوو-مەوە کەسیان نەبوو کە لە خوێندا شەلاڵ نەبێ .

ئازاد گووتی :-

- باشە مە بەستیان چی بوو وایان لێ کردی ..!؟

- مەبەستیان ئەوە بوو بمترسێنن و ناچارم بکەن سەریان بۆ شۆڕ بکەم ، دوایی بۆم دەرکەوت کە زۆر کەسی دیکەش هەبوە وایان لی کردون بەلاّم من ئەوشتەم

نەبیستبوو .

ئەوانە هیچیان کاریان تێ نەکردم ، هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە کە بە دەستی خۆم ، خۆم پێوە کەم باوەڕم بەو ڕێگایە زۆر پتەو بوو کە گرتبوم ، خۆم بۆ هەموو جۆرە ئەشکەنجەیەك دانا بوو ، بەلاّم هەرگیز بیرم بۆ ئەوە نەدە چوو کە ...( ڕەنگی سور هەلّگەرا و ناوچەوانی تێك نا ) بیرم بۆئەوە نەدەچووکە درندەیی و نامرۆڤایەتیان بگاتە ئەو رادەیەکە ......

( قسەکەی بڕی و بێ دەنگ بوو )....

- کە .... چی .. بزانم چی یان لێ کردی ..؟

- ڕۆژێك بردمیانە دەرێ ، وام زانی هەروەك ڕۆژان ئە - شکەنجەم دەکەن ... بۆ ژوورێکیان بردم ... ئەوەی دیتم هەرگیز چاوەڕوانم نەدەکرد ... زۆرم پێ سەیر بوو کەدیتم خێزانم لەوێ ڕاوەستابوو ، چاوێکی بڕیە چاوەکانم و فرمێسك بەسەر گوناکانی دا هاتنە خوارێ سەرەتا لەدلّی خۆمدا گووتم ڕەنگبێ ڕێگایان دابێ بێتە دیدەنیم ... بەلاّم دوایی بیرم کردەوەو گووتم - (نەخێر ئەوانە شتی وایان لێ ناوەشێتەوە ) ، بیرم بۆ هەموو شتێك دەچوو، بەلاّم بۆئەوەنا کەئەوان بە تەمای بوون ....

- بەتەماى چى بوون ؟..

خالید هەناسەیسوار بووبوو، هەمووگیانی قینی لێ دەباری، قسەکانی پچڕ پچڕ بۆ تەواو دەکراو گوتی:-

- ئیتم بە بەر چاوی منەوە خیزانمیان ڕووت کردەوە ... قیژاندم .... بۆ خاتری خوا .... ئەوەنەکەن ...هەرچی ئێوە دەڵێن وادەکەم ....

گووتیان :-

- ئەگەر پەشیمان بیەوە بۆ خۆت دەزانی چ دەکەین ..

گووتم :-

- هەرگیز پەشیمان نابمەوە ، ئەوەی ئێوە بیلێن وا دەکەم ... بەڵێ لەو کاتەدا هیچ شتێکم لە بیر نەما تەنانەت خۆمم لە بیر چووە ، بەری چاوم تاریك بوو ... مێشکم توانای بیر کردنەوەی نەما ، ئیدی ناچاریان کردم ...

- ناچاری چیان کردی ..؟

- بردیانمەوە ژووری تەحقیق، کاغەزێکیان لەبەر دەستم دانا ، نەمکرد سەرەتا بیخوێنمەوە ، داوایان لی کرد م لە بنەوە ئیمزای کەم ، منیش بێ بیر کردنەوە یەکسەر ئیمزام کرد، ئەوجا داوایان لی کردم بیخوینمەوە، دەزگایەکی تومارکردنیش ( تەسجیل ) یان لەبەردەمم

دانابوو ، کاتێك خوێندمەوە سەرەتا ئیعتیرافی
برادەرەکانم نوسرابوو، ئەوەیان هەرقەبناکە
پێ ی ڕازی بووم، بەڵام پاشان دێتە سەر ئەوە ی
کە نەکراوەو نەبوە ، ئەوەی کە هەرگیز بەبیرمدا
نەهاتوە لە شتی خراپ و ناڵەبار درابوە پاڵم.

پاشان بۆلای خێزانمیان بردمەوە .... کەچی ئەو
دڕندانە ، ئەو فاشیستانە ، ئەوەی کە ویستیان
بیکەن شاخیرەکەی هەر کردیان ..

( دیسانەوە بی دەنگ بوو سەری نایە بەرخۆی )

شازاد گووتی :-

- سەرئەنجام ...؟

- سەرئەنجام حوکمیان دام ..

- چەند ..؟

- ئیعدام ..

- (بە سەرسوڕمانێکەوە ) چی ..ئیعدام ..!!!؟

- بەڵێ ئیعدام ..

- ئەدی دوایی چۆن لێت خۆش بوون ..!!؟

- لێ خوش بوونی چی ..!!

شازاد چاوی بڕیبوە چاوەکانی خالیدودەمی لیک-

کردبووه ، حەپەسابوو ، هەرچەندی دەکرد بڕوای نەدەکرد ئەو ئینسانەی وا بە رامبەری دانیشتوە چاوەڕێ ی مردن دەکات ، پێ ی وابوو کەسێك حوکمی مردنی بە سەردا بدرێ ، ئیدی پێکەنین و قسەی خۆش بەزاری دا نایەت ..... تا ماوەیەك قسەی بۆ نەکرا پاشان کەمێك هاتەوە سەرخۆی و پرسی:-

- ئەدی برادەرەکانت ..؟

- ئەوانیش هەریەکی (١٠) ساڵ و (٢٠) ساڵ و ئەوەش کە بەناو کرابوو بەوەزیر حوکمی ئەبەدیان بە تەنگە- دا داو بۆ زیندانیان بردن ..

- زیندان ..!! ئەدی ئێرە چییە ..؟

- ئێرە دایەرەی ئەمنە ، تا تەحقیقت لە گەڵدا تەواودەبێ ، پاشان کە حوکمیان دای بۆ زیندانێکی وەك زیندانی ( ..... ) ت دەبەن ، خۆ هەشەفریا ناکەوی بیگوازنەوە ، هەرلێرە گوللە بارانی دەکەن ، یان لە ژێر ئەشکەنجەدا دەمرێت ...

- ئەدی تۆ بۆ لێرەدا ماویەوە ..؟

- بڕیارە پاشی چەند ڕۆژی دیکە منیش بگوازنەوە ، جا نازانم کەی حوکمەکەم بەسەردا جێ بەجێ دەکەن ..!

شازاد وەك بیەوێ دڵخۆشی خالید بداتەوە گووتی :-

- هەرچۆنێك بێ ، من دڵنیام كە تۆ لە مردن بە-
هێزتری هەروەكوو بۆ خۆشت دەتگووت ، مروڤ نابێ
لە ژیان هیوا بڕو رەش بین بێ زۆر كەس حوكمی ئیعدام
دراون دوایش لێیان خۆش بوون یان حوكمەكەیان
كەم كردونەتەوە .

- ( بەبزەیەكەوە ) ، كاكە شازاد هەرچەندە من لە-
وانە ، چاوەڕوانی ئەوەناكەم لیم خۆش بن ، بەلام لە گەڵ
ئەوەشدا هیوای من بە ژیان لەو پەڕی بەرزی دایە
هەرگیز خەفەتی ئەوەش ناخۆم كە ئیعدام دەكرێم
بەڵكو خەفەتی ئەوەمە ، ئەو تۆمەتانەی دایانە
پالم ، زۆر لێیانەوە دوورم ئەوەی ئەوان بۆ منیان
ڕێك خست ، بەدەممدا نایە بیلێم .. جاسوسی بێگانە
، قاچاخچیەتی ، بازرگانی كردن بە لەشی ئافرەتانەوە
لەگەڵ چەندان تۆمەتی ناڕەوای دیكە كە لە راستی دا
ئەو شتانە لەووڵاتی ئێمەدا هەرقەدەغەنین و خۆ ئەگەر
بێت و بەڕاستی ئەو شتانەم بكردایە ئەوە دڵنیام كە
نەدەگیرام و هیچیان پێ نەدەگووتم . بەلام من هەرلە
بنەڕەتدا نەدەبوو جگە لە كاغەزێك كە پاكی و بێ
تاوانی من بسەلمێنی ، هیچ شتێكی دیكەیان بۆ

ئیمزا بکەم .

- بەڵام هەرکەسێك لەجێگای تۆ بوایە ، ئەوەی هەردەکرد کە تۆ کردوتە .

- نا ... نا ، هەرگیز نەدەبوو من ئەوەم بکردایە ، نەدەبوو بەدەستی خۆم ئەو تاوانانە وەپاڵ خوم دەم کە نەمکردون ، ئێستا بیر دەکەمەوە دەڵێم دەبایە بەرگەی هەموو شتێکم بگرتایە ، دەبایە قبوڵی ئەوەم بکردایە چی لە خێزانم دەکەن بیکەن ، چونکە ئەشەرەفی ئینسانێك ، هی ئافرەتێکی پاك و بێ گەرد زۆر لەوە زیاترە کە ئەوانەی نازانن مانای ئەرەف چی یە بی شکینن ، ئێستا لە هەموو کاتێك زیاتر خێزانەکەمم خۆش دەوێ ، لەهەموو کاتێك بەشەرەفترە لە لام ، مرۆڤ زۆر لەوە قایم ترە کە لە بەردەمی شە و ترسنۆکانەدا بە چۆکدابێ .

تاوانبارو بی تاوان لای ئەوانە وەکو یەك وایە ، بەڵکو زیندانیەکی پیاو کوژ یان دز لە زیندانیەکی سیاسی گەلێك بەنرخ ترە .

ئەو پیاوە پیرەی کە لەو سوچە دانیشتوە ( دەستی بۆلای پیاویك درێژ کرد کەلەو سوچەی لای ڕاستیەو دانیشتبوو )، ناوی مام هومەرە ، شوان بوە ، لە سەر

ئەوەی چەند قاوانە فیشەکێکی ژەنگاوی دیتوتەوە ،
گرتویانە ، کاتێك بە دەستیەوە دەبینن بەوەی لەقەڵە م
دەدەن کە چەکی دژی ڕژێم هەڵگرتوە . ئەوە دوومانگە
دەیهێنن و دەیبەن هەموو لەشیان شکاندوە ، داوای لێ
دەکەن ئیعتیراف بکا ، ئەو هەژارەش ئاگای لە هیچ
نی یەو ، ئەوقسەی کردویەتی هەرئەوەیە .

یان پێش ماوەیەك کابرایەکی دیکە لێرە بوو لە
سەرئەوە گیرا بوو کە بەیاننامەیەکی دژی ڕژێم
بە دیواردەرەوەی ماڵەکەیانەوە هەڵدەواسرێ ئیدی
بێ ئەوەی ئاگای لەهیچ بێ (١٠) ساڵیان بەسەردا سەپاند-
وەو ئێستا لە زیندانی (.....) .

جا دەیان و سەدانی لەم بابەتە هەن کەبێ ئەوەی
ئاگایان لە هیچ بێ حوکمێکی زۆریان بەسەردا داون ،
چەندانیش هەن کەلەناو ئازارو ئەشکەنجەو هەربۆئەوە ی
لە کۆڵی ببنەوە ، خۆم ئاسایی ، تاوانێکی گەورەیان
داوەتە پاڵ خۆیان و ، سەرئەنجام خنکێنراون . تەنانەت
دەگێڕنەوە جارێکیان هەرئەلێرە (٢٦) کەس دەیەن کە
ئەنجامی مەحکەمەکەیان پێ رابگەیەنن ، ئەوانیش هەر
لە خۆیانەوە ڕیز دەبن ، ئیدی بێ ئەوەی بزانن کێ
کێ یەو کێ کێ نیە دەڵێن :- لەلای ڕاستەوە بۆ چەپ

ئەم ئەشكەنجە ئیعدام ، ئەو ئەشكەنجەی دیكە ئەبەد ، ئەو چوارە بیست ساڵ و ئیدی بەم شێوەیە حوكمی قەرەقوشیان بەسەردادەدەن .

لەو كاتەدا دەرگاكە كرایەوەو ئەو هێرش قادرەی كە دوای نان خواردنی نیوەڕۆ بردبوویانە دەرێ بە چوار دەستەكی فڕێ یان دایە ژووری ... بەكوڵ دەگریاو فرمێسك هۆن هۆن بەچاوانی دا دەهاتنە خوارێ ......

خالید یەكسەر داوای یارمەتی لە ئازاد كرد ، هەستاو بە دەنگیەوە چوو ، دەستێكی بە سەریدا هێناو هێندەی بەزەیی پێ دا هاتەوە ، بەدەست خۆی نەبوو ئەویش كوڵی گریانی هەستاو چاوانی پڕ بوون لە ئاو ئازەزووی دەكرد وەكوو منداڵێكی ساوا لە باوەشی بگرێ و لە تەوقی سەریەوە تا بەری پێ ی ماچی بكا بەلام ڕووی نەدەهات لەو ژوورەدا ئەوە بكات ، ئەوێنی حەسانەوەی بۆ ساز دەكردو لەجیاتی دەستە نەرمەكانی دایكی فرمێسكە ئاگراویەكانی بۆ دەسڕیەوە ، ئەو جێگایانەی بۆ دەشێلا كە لێدانیان پێ كەوتبوو ئازاریان هەبوو ، ئازاد چاوی لێ بوو ، چۆن بەیانی بەدەنگ ئەوەوە هات و لە ئازارەكانی كەم دەكردەوە ،

ئێستاش ئاوا بەدەنگ بەکێکەوە دەچێ و دڵخۆشی دەداتەوە کە نازی دایکیان لێ بڕیوە .

شازاد لەم لایەوە دیتی کابرایەکی مەیلەو بەساڵا-چوو هات و سڵاوی کردو گووتی :-

- داوای لێ بووردنت لێ دەکەم کەزوو نەهاتم ، خوێەو کابرایە ، ( ئیشارەتێکی بۆ خالید کرد ) ، دەڵێ ی قیرو بنێشتە ، کە بە یە کێکەوە نووسا ئیدی لێ ی نابێتەوە ...

( شازاد نەیدەزانی مەبەستی چی یە بەڵام هەر چەندی دەکرد پاکی لە ناو چاوانی دا بەدی نەدەکرد ) .

کابرا درێژەی بە قسەکانی دا :-

- کاکە هەردەڵێی کوێخایە ، هەرچی هاتە ئەم ژوورە ، ئیدی ئەوە خۆی لی دەکا بە ساحێب ، وورت ، وورت .. ، دەچێتە بنا گوێ ی تا لە خەتەی دەبا ، خۆی حوکم دراوە بە ئیعدام دەیەوێ ماڵی خەڵکیش وێران کا ...

گوێت لێ بێ با برای خۆت ئامۆژگاریەکت بکات :-

- ( بە بێتاقەتیەکەوە ) فەرموو ..

- خۆ من نە دەتناسم و نە دەزانم چ کارەی ، بەڵام من وەکو برایەکی دڵسۆز بۆ هەمووکەس وەکو ئینسانێک ،

حەز بە چاکەی خەڵکی دەکەم .. . برام نەکەی قەت بەقسەی ئەم و ئەو هەڵخەڵەتیێ ی ، بە خودای ئەم حوکمەتە هیچی لەگەڵ ناکرێ ، ئەوەی بیەوێ بەربەرەکانی بکات ئاخیرەکەی هەرتیدا دەچیت ، ئاخر خۆم بۆ کێ بە کوشت بدەم ، تو خوا لاویکی وەکو تۆ ..... نازانم ناویشت چییە .؟ ( ئازاد وەڵامی نەدایەوە ) بۆچی بە خۆرایی تەمەنی جوانی خۆت دابنێی ..؟ یان خۆت بە لێدان و کوتان بدەی ...!؟ بەقسەی برا ی خۆت دەکەی ، هەرچی دەزانی پێیان بڵێ و خۆت لەم کولە مەرگیە ڕزگار کەو بچۆوە بلوەشی داکو بابی خۆت ..

- باشە ئەدی جەنابت بۆ وەك دەفەرمووی وا ناکەی ..؟

- جا کێ دەڵێ وام نەکردوە ..!؟

- ئەدی کە وایە لێرە چ دەکەی ..!؟

- ئەمن هەر یەك دوو ڕۆژی دیکەیەو بەر دەبم ..

- منیش هیچم نەکردوەو وەکو تۆ باشی چەند ڕۆژیکی دیکە بەردەبم ..

- چۆن هیچت نەکردوە .. خۆ هارنەبون قابیلە لە خۆیانەوە گرتویانی ..؟

هاتە سەر زاری کە بلێ بەری وەڵلا هاربوون ، بەلام

نەیوێرا ، قسەکەی گێڕایەوەو گووتی :-

- هلرنەبوون بەڵام بەهەڵەدا چوون ..

- بە خودای بابم ئەوانە بە هەڵەدا ناچنو هیچیان لێ

وون نابێ . من تاوانێکم کردبوو هاتم دانم بنە

تاوانەکەی خۆم دا نەلو داوای لێ بوردنم لێ

کردن، ئەوانیش لێم خۆش بوون ...

( شازاد کە باش لە مەبەستی گەیشت ئیدی گوێی

بە قسەکانی نەدا ، کابرا هەردەپرسیت ،بەڵام شازاد

نە رووی تێ دەکردو نە وەڵامیشی دەدایەوە .. تا وای

لێ هات کابرا خۆشی تێ گەیشت کە قسەکانی

جێگای خۆیان ناگرن .. )

پاشان هەستایە سەر پێ و گووتی :-

- ئەوەی لە سەرم بوو پێم گووتی ، ئیدی تۆش

خۆت و عەقڵی خۆت ..

لەوبەرەوە خالید چاوی لێ بوو کە کابرا هەستاو

جێگاکەی چوڵ کرد ، ئەویش هەستاو هاتەوە ، شازاد

پێی گووت :-

- ئەو کابرایە چی بوو قسەی هەلەق و مەلەقی دەکرد؟

- لە راستی دا دەبوایە من هەرزوو پێم بناساندیتایە

لێرە رژێم دەمی هەندێک بەندی چەور کردوەو ویژدا-

نـي كريون ئيدى ئەوانە جاسوسى لەسەر بەندييەكانى ديكە دەكەن و هەوڵ دەدەن وورەيان بروخێنن يان نهێنى يان پى بدركێنن ، چونكە زۆر كەسى سادەو پاك هەن ، ئەوانە بە ئينسانى چاك تێى دەگەن و لە كاتيكا كە خۆيان لە بەر لێدان وئەشكەنجە رادەگرن كەچى گرێى دڵى خۆيان لاى ئەو جۆرە كەسانە دەكەنەوە ....

++++++++++++++++

دواى نان خواردنى ئێوارى ، شازاد مات و بێ دەنگ لە خەياڵ و بير كردنەوە دابوو ، پێى وابوو ، زۆر دەمێكە لە زينداندا دەژى ، پێى سەير بوو كە شەو شەوو رۆژەى تا ئيستا لێرە بە سەرى بردوە ، دريژترين ، شەوو رۆژ بون لە ژيانيداو بە جۆريك كە هەمو خوشيەكانى ژيانى بير چوبۆوە ....

لەلايەكى ديكەوە بيرى لە خاليد دەكردەوەو تا دەهات زياترى خۆش دەويست .. ئەو كاتانەى كە قسەى خۆش و پێكەنينى لێى دەبيست لەبيرى دەچۆوە كە لە زيندان دانيشتوە .. شازاد بەدڵ شارەزووى دەكرد كەوەكوو خاليد شازاو بە توانا بێت ... لەدڵى خۆيدا بيرى دەكردەوە ئەگەر بێت و ئەو بە ئيعدام حوكم

بدرێت ، لەو شوێنەی کە پێی رادەگەیەننا یەکسەر گیانی دەردەچێت ، کە ناوی ئیعدامیان دەهێنا تەزوویەك بە لەشی دا دەهات و ترسێکی زۆر باڵی بەسەردا دەکێشا و دەیگووت:( بەراستی شتێکی ناخۆشە بەڵام هەرچۆنێك بێ لە کڕنۆش بردن ،لە ویژدان فرۆشتن ،لە خیانەت خۆشترە ..

شازاد هەروا لە بیر کردنەوەدابوو،خالید بە بزەیەکەوە سەری هێنایە پێشێ و گووتی:-

- دیسان کەوتیەوە بیر کردنەوە ، خۆزگە دەمزانی بیرلە چی دەکەیەوە ..!! رەنگە ئێستا خەیاڵت لا ی خێزانت بێ ..!!

- نەخێر خۆ من تا ئێستا ژنم نەهێناوە ..

- کەواتە بیر لە خۆشەویستەکەت دەکەیەوە ناکا بلێی خوشەویستیشم نیە .!!

بزەیەکی هاتێ و هەناسەیەکی هەلکێشا . گووتی:-

- بیرم لەو نەدەکردەوە ، بەڵام تۆ برینت کولاندمەوە ..

- ئەی فەدار ( سەری بۆ بنا گوێی برد ) پێم بلێ بزانم ناوی چی یە ..؟

کەمێك بێ دەنگ بوو پاشان گووتی:-

- بۆ پێت خۆشە بزانی .. ؟

- هيچ،ئەگەر حەزناکەی ،پێویست نیە بزانم ..
- بۆ حەز ناکەم ، ( بەبزەیەکەوە ) ، ناوی نازدارە ....
- نازدار .. وا دیارە زۆریشت خۆش دەوی .. ها ..؟
- زۆر .... زۆر ...
- بێ گومان ئەگەر بەربوی یەکسەر دەیهێنی ..

شازاد هاتە سەر زاری کە بلێ ( کوا بەر دەبم..؟)، بەلام بیری کەوتەوە کەشەرمە بەرامبەر خالید بێ هیوایی بنوینێ . بۆیە گووتی :-

- بێ گومان دەیهێنم ..

( لەپڕ تەقە تەق بە شەق لە دەرگا بەربون ) .

- یاللا بنون ..

( یەکسەر هەریەکە لە راست خۆیەوە خوی گرمولە کرد ) .

شازاد گووتی :-

- ئەوە چیە ..؟
- کاکە لێرە شاوایە .. ئیواران هەرزوو دەمانەنوێنن ، نابی کەس ووڕتەی لێوە بێ ، کەچی هەرخۆشیان تاکو بەیانی شەق لە تەنەکە و دەرگا هەلدەدەنو جنێومان بەسەردا دە بارێنن ، تاکو خەومان لێ نەکەوێ .

( یەکێك لەبەر خۆیەوە کوکی ) ..

ئەمنیێك لە دەرەوە هاواری کرد :-

- ئەم گوت بنوو، سەگی سەگ باب .. بێم هەموو لەشت بشکێنم ..!؟

هەموو کپ و بێ دەنگ لێ پاڵ کەوتبوون ئازاد هەستی بە ملندوێتی یەکی زۆر دەکرد ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا خەوی لێ نەدەکەوت ، دەیان خەیاڵی جۆراوجور بە مێشکیدا دەهلتن و دەچوون ، بیری لە هاورێ کانی ، لە دایکی ، لە خوشەویستەکەی دەکردەوە ، ئەو قسەی نازداری بیر نەدەچووەوە کە رۆژێکیان پێی گوتبوو :- ( ئازاد .. ئەوەی منو تۆی بەیەکتر ناساند ، بیرو باوەڕێکی مەزنە ، ئەگەر وازلەو بیرو باوەڕە بهێنی منیش واز لە تۆ دەهێنم و هەرگیز ناتناسم .... ) .

لە دڵیەوە ئارەزووی دەکرد خۆشەویستەکەی لە کەلێنیکەوە چاوی لێ بوایە کەوا لەسەر ئەو بیرو باوەڕەی کە هەردوکیان خۆشیان دەوێ زیندانی کراوە و پیاوانەش خۆی ڕاگرتوە .. ئارەزووی دەکرد لەدوورەوە دەستی بگەیشتایەتە پرچە جوانەکانی و تێر تێر بونی بکردنایە ، بیری لەوە

دەکردەوە کە لە زیندان بەربوو کاتێک کە دەیبینێتەوە بەهەموو هێزیەوە لەباوەشی دەگرێ و بە خۆیەوە دەگوشێ و تا دەتوانێ چاوی، گۆنای ، دەمی ، گەردنی ماچ دەکات .. هێندە بۆ دیتنی تامەزرۆ بوو وای دەزانی زۆر لە مێژە نەی دیوە دەیگووت :- ( خۆزگە نازدار گیان بمتوانیبا جارێکی دیکەش لە نزیکەوە چاو ببڕمە چاوەکانت .. )

شازاد لە لایەکی دیکەشەوە بیری لە دایکی دەکردەوە ، زۆری خۆش دەویست بەڵام لە ژیانیدا هیندەی ئێستا هەستی بەو خوشەویستیە نەکردو ... لە دڵی خویدا دەیگوت :-

( شای دایکی شیرینم چەندە شارەزووی دەستە نەرمەکانت دەکەم تاکو ماچیان بکەم ، پرچە سپیەکانتم چەندە لاپیرۆزن ، شاخۆ دایە گیان ئێستاش هەرچاوەڕێی بیمەوە یان بۆت دەرکەوتبێ کە زیندانیم و ڕەنگە ئیدی نەتبینمەوە ... شای ئەو فاشیستانە چەندە بێ بەزەیین .. چەندە دڵ ڕەقن !!.. چەندە بی ویژدانن ! دەبێ چۆن دڵیان بیهێنی و چ هێزیکی ئەڕاوی پاڵیان پێوە بنێ ، ئەو مرۆڤە پاك و بێ تاوانە ئازار بدەن و ئاوا سوکو بێ نرخ بی لایان ...!! ؟ دایە گیان بۆت

ئاگیرمەوە کە چیمان لێ کردوم ، ئەنا گیانت دەردەچێ ، دەبێ بلێم زۆریمان خزمەت کردم ، بەلێ .. زۆریان خزمەت کردم ..!!! ) .

شازاد ئادەهات زیاتر وورەو هیوای دەدایە بەر خۆی و دەیگووت بە زۆر ئەنگە مرۆڤێك کە خاوەنی بیر باوەرێکی مەزن بێت لەبەر دەم هی ترسنوك و چەپەلدا مل کەچ کا .. ..

هەستی بە شادمانیەکی زۆر دەکرد کە دەیزانی هلورێ کانی دەستگیر نەکراون و لە دلی خویدا دەیگووت بە ( ئەخێر هلورێ خۆشەویستەکانم ئەوەی فەرهاد کردی من هەرگیز لە گەل ئێوەی ناکەم ..... دلنیا بن ، بێ باك بن .. شانازیتان پێوە دەکەم ، لەهەموو کاتیك زیاترم خۆش دەوێن .. ئەگەر پاراستنی نهێنی ئێوەو ژیانی ئێوە بەدەست من بێ .. من بە ژیانم دەیپاریزم ..) .

تا دەهات بروای پتەو تر دەبوو لەدلی خویدا بریاری دابوو ، ئەگەر جارێکی دیکە بۆ لیدانی بهێنەوە نابێ فرمێسك بە چلوانیدا بێتە خوارێ نابێ لاوازی نیشان بدا .

لە پر بیرێکی وا بە مێشکی دا هات کەدلی تاساند:-

ئەگەر یەکێك لە خوشکەکانی بێنن و ئەوەی لە خێزانی خالیدیان کرد لەوانیشی بکەن چی بکات ..!!؟

دەیویست ئەو شتە لەبیر خۆی بەرێتەوە بەلاّم نەیدەتوانی و لەدڵی خۆیدا دەیگووت :-

( ئای خوایە گیان ... هەرگیز شتی وا نەبێت ..شتی وایان بەبیردا نەیەت .. بەلاّم ئەوانە درندەن .. ئەگەر کردیان من چی بکەم ..؟ .. ناکو دەتوانم سەری خوم بە دیوارەکەدا دەدەم و خۆم دەکوژم ......!!!

بەلام نا... خۆم ناکوژم .. خالید ڕاست دەکات .....

شەرەفی ئافرەتێکی پاکو بێ گەرد بەشێنەیی بێ نرخ و چەپەڵ لەکەدار ناکرێ .. چیدەکەن با بیکەن .. بڕیار بێ سەریان بۆ هۆرنەکەم .. )

بەم جۆرە خەیالاّنەوە ووردە ووردە خەو بردیەوە .

بەیانی هێشتا دنیا ڕوناك نەبوبووە تەقەی ئەقی ئەمنەکان کەلە دەرگاکەیان هەڵدەدا ئازادیان بە ئاگا هێناو هەموو بەندیەکان پێکەوە ڕاست بونەوە.

++++++++++

سەعات دەورو بەری (٩) ی بەیانی بوو لەگەڵ خالید پێکەوە دەدوان .. ئەمنیك دەرگاکەی کردەوەو بە دەنگێکی ناساز بانگی کرد :-

- شازادکەریم ...

شازاد راچڵەکی ،ڕەنگی دەم و چاوی تێک چو ، دڵی دەستی بە کوتە کوت کرد ، هەستی کرد سەر ی دەسوڕێو پشووی سواردەبێ ...

دووبارە کابرا بانگی کردەوە :-

- یاڵڵا .. خێراکە هەتا نەهاتوم بە شەق بتبەم ...

هەستایە سەر پێ ترس تێنی بۆ هێنا بو ، بەلام هەرزوو بریارەکانی خۆی بیر کەوتەوەو ، توانی کەمێك بێتەوە سەر خۆی .. کاتێك گەیاندیانە ژوور ی تەحقیق ، هەمان چرو چاوە ناشیرینەکانی دوێنێی دیتەوە کە بەرامبەری دانیشتبون ..

کابرای وورگ زل ڕووی تێ کردو گووتی :-

- پشوویەکی باشمان دابی ی ها .... بڵێ بزانین ئەورۆ دەڵێی چی ....؟

- چیتان دەوی ..؟

- شتیکی ئەوتۆمان ناوێ ، دان بەوەدا بنێی کە تۆ لە ڕێکخراوێکی سیاسی دژی ڕژێم کارت کردوە ، کاغەز- ێکیشمان بۆ ئیمزا بکەی و تیایدا بەڵێن بدەی کە کەلەمەو دوا لە هیچ ڕێکخراوێکی سیاسی دا کار ناکەیت ، شوێنی ئەوانەشمان پێ نیشان بدەی کە

دوێنی برادەرەکەت ناوەکانی گوتن .

- هەروەکو دوێنی پێم گووتن من لە هیچ ڕێکخراوێکی سیاسیدا کارم نەکردوە . هەربۆیەش پێویست ناکا بەڵێنی ئەوەتان بدەمێ کە کاری سیاسی نەکەم . شوێنی ئەوانەش کە مەبەستانە باشتر وایە لە فەرهاد خۆی بپرسن ، چونکە من هیچ پەیوەندیەکی سیاسیم لە لە گەڵ ئەوانەدا نی یەو ، ئەو قسانەی فەرهاد دەربارەی من کردونی هەموی درۆن ..

- ئێمە باوەڕمان وایە ئەو قسانەی فەرهاد کردونی هەمووی ڕاستن ، تا ئێستانەش کە پێمان گووتی جێ بە جێی نەکەی لە کۆڵت نابینەوە ، فەرهادیش ماڵی ئەوانەی هەموو پێ گووتوین کە دەمانەوێ بەلام ناوەسانە خۆیان شاردۆتەوەو ، ئیمە باوەڕی تەواومان هەیە کە تۆ ئەو شوێنانە دەزانی کە خۆیان لێ شاردۆتەوە .

ئازاد لە دڵی خۆیدا زۆر شادمان بوو کاتێك بە تەواوەتی بۆی دەرکەوت کە هاوڕێکانی خۆیان شاردۆتەوەو هیچ کامێکیان دەستگیر نەکراون .

پاشان گووتی :-

- ئەوەی پێم گووتن هەرئەوەیە ..

- ئەوەی پێت گووتین هەرئەوەیە ..؟یانی جەنابت دەتەوێ لەسەرقسەی خۆت پێ دابگری و بە حسابی خۆت ئیمە هەڵخەڵەتێنی؟ بەلام ئیمە لەوسەری هاتوینە-وەو ، وات لێ دەکەین بە هەنگوینی بلێی ژەهرەمار.

ڕووی لە ئەمنەکانی بەردەرگا کردو گووتی:-

- بیبەن ..

چەند ئەمنێك هاتنو بە پەل کێشیان بردیانە ژوورێك، یەکێکیان ڕووی تی کردو گووتی :-

- بە دەستی خۆت خۆت ڕووت کەوە ..

( زۆر باش دەیزانی ئەگەر خۆشی ڕوت نەکاتەوە، وەکو دوێنی خۆیان هەر ڕووتی دەکەنەوە ... بۆیە زو و جلەکانی لە بەرخۆی داکەند ...)

یەکێك لە ئەمنەکان گووتی:-

- ئەو شوشانە دەبینی کەلەسەر ئەو مێزە دانراون؟

( تەماشای کرد چەندان شوشەی وەکو هی بیرەو ساردی لە سەر مێزەکە ڕیز کراون نەیدەزانی ئەو شوشانە بو چین .. !! پێ ی وابوو بەو شووشانە لێ ی دەدەن ، یان دەیان شکینن و پارچە-کانی لەلەشی هەلدەچەقێنن .... )

- وەلام دەوە هەتیو دەیبینی ..؟

-(لە ژێر لێوەوە )، شا ..

- دە فەرموو بە شارەزووی خۆت شوشەیەك هەلبژێرە.

- بۆچی هەلّی بژێرم ..!؟

( هەموو دایانە قاقای پێکەنین )

- نازانی بۆچی ..؟ بۆ ئەوەی بچیتە ناوی ..

- ئاخر چۆن بچمە ناوی ..!؟

- ئەگەر نەتوانی بچیتە ناوی ئەوا شوشەکە دەچێتە ناو تو ..

- مەبەستان چییە ..!؟

- تۆ ئاگەی گەوجی بۆ میشك ئێستا تێت دەگەیەنین ..

( شوشەیەکیان لەسەر ئەرزەکە داناو ئەویشیان بە چیچکانەوە لەسەر دانا .. ئەوجا دوو کەس هاتن و هەموو قورسایی خۆیان خستە سەرشانوملی ... تاکو هێزی تێدابوو قیژاندی ...وەبیری کەوتەوە کە ئەو بڕیاری دابوو ئیدی هاوار نەکا ... بەلاّم هەرچەندی کرد لە توانایدا نەبوو ئەو هاوارەلە سینگی دا دامرکێنیتەوە .. لەوکاتەدا پێی وابوو هیچ ئازارێك لەوە ناخۆشتر نییە کە ئێستا ئەوی تێدا دەژی ، ژیانی لەبەر چاو کەوتبوو ، لەهەموو کاتێك

زیاتــر بەزەیی بە خۆیدا دەهاتەوە ، خۆی زۆر بێ دەسەلات دەهاتەبەرچاو بەرامبەر ئەوانەی تۆزقاڵێك مافی ئەوەیان بەدەستەوەنییە کەئەوکارە بەگەکەن ، لەدڵــی خۆیدا دەیگوت : دەبــێ کەسێك نەبــێ لەم دنیایەدا لــە سەر یان بە جــواب بێ ... دەبــێ خەڵــکی ئــەو راستیانە نەزانن کەلێرەدا روودەدەن دەبــێ هیــچ جێگایەکــی دیکە هەبــێ لەم دنیایەدا بــەم شێوەیــە رەفتاری لەگەل ئینســانــدا تێدا بــکرێ ؟ ئەم بیرانە هەمــووی لە ماوەی چــەنــد چرکەیەکــدا بە مێشکــی دا هاتن ...

بەلەرزە لەرز خەریك بوو بێجامەکانــی لەبەرکاتەوە ... یەکیکــی دیکەی دیت بە لۆژەلۆژ هینایانە ژووری.. ، بەســەرو سیمایدا دیاربوو ئەشکەنجەی زۆر دیوە ..... بەســاڵدا چووبوو ، پــشــتی کۆم بــووبوّوە ، ســەرو ریشــی هاتــبوو کە ســەرتاپا سپی بــوو . دەستیان بەهەڵکێشــانی مــووی ریش و سمێلی کــرد .. بــە هەمــوو هێزیەوە هاواری دەکــردو دەستی دەبرد تــا دەستیان بــگرێ و نەیەڵــێ ریش و سمێلی هەلکێشــن ، بەلام هەموو جارێ جگەرەیەکیان بەدەستیەوە دەنا ئەویش بە ناچاری دەستی بەردەدایەوە خــوارێ ، هیندەی بــە

چەندنگ موولە ڕیش وسمێڵی هەڵکێشن ، دەم و لێوی هەمو ئەستور بووبوو، ئەویش هیچی بە دەست نەمابو و بە کوڵ دەگریاو فرمێسک بە سەر ڕیشە سپیەکەیدا دەهاتنە خواری .

شازاد سەرەڕای هەموو شازارەکانی خوی ، ئەوەی بەو کابرا پیرەیان کرد برینێکی نوێیان خستە دڵیەوەو لە ناخی دەروونیەوە شازاری دەچەشت ، وای دەزانی ئەوە بابەتی و شازاری دەدەن، ئەویش بێ دە سەلات تەماشای دەکات ....

بۆ ژووری تەحقیقیان بردەوە ..

هەمان کابرای جاران هەستایە سەرپێ و بێ ئەوەی ڕوو لە شازاد بکات گووتی :-

- ئەگەر ئەو شتانەی پێمان گووتی جێ بە جێ یان نەکەی ، ناچارین هەموو ئەو تاوانانەت لە سەر زیندوو دەکەینەوە کەکردوتن ، جا ئەوکاتە هیچ ڕێگات لە بەردەمدا نامێنێتەوە بەرگری لە خۆت بکەی و حوکمی خنکاندنت بەسەردا دەدرێ ....

موچرکێک بەلەشی دا هات و بە پەشوکاویەوە گووتی :-

- تاوان ..!!؟ تاوانی چی بۆخلتری خوا ..!؟ من هیچ تاوانێک لە خومدا شک نابەم ..!!!

- بىا .. تۆ تاوانێكی زۆر گەورەت كردوە ..

- ئاخر .. چتاوانێك ..!؟ بەچی باوەڕ دەكەن من هیچ تاوانێكم نەكردوە ..!!!

- پێویست ناكا سوێندمان بۆ بخۆی .. ئێمە زۆر باش دەزانین كە تۆ پیاوێكت كوشتوە ..

- چی ..!!؟ پیاو ...!! من و پیاو كوشتن .....!!!

هەرگیز ... من لە ژیانم دا مریشكێكم سەرنەبریوە ..، چۆلەكەیەكم نەكوشتوە .. چۆن دەتوانم ئینسانێك بكوژم ..!؟ چۆن ..؟ باوەڕم پێ بكەن من لە شتی وا دوورم ..

- ئەگەر ئەو شتانەمان بۆ جێ بە جێ بكەی كە پێشدان پێمان گووتی ئێمە لەوتاوانەت خۆش دەبین .

- ئاخر من هیچ تاوانێكم نەكردوە تالێم خۆش بن، ئەو كەسەی ئەو شتەی بەشێوە گووتوە درۆ دەكات .

- پاڕانەوەو سوێند خواردن لای ئێمە پارە ناكا ئەوە ی دەمانەوێ دەیكەی یان نا ..؟

( ئازاد زور بەشوكابوو نەیدەزانی چون خۆیلەم داوە دەرباز كات، بیری دەكردەوە كە پێ یان بلێ ئەوپیاوە كێ یە كە گوایە ئەو كوشتویەتی چ بەلگەیەك هەیە، كێ لەسەری شاهیدە، بابیهێننە

بەرەورووی ... بەڵام لەم تەگبیرەش پەشیمان بۆوە، چونکە دەیزانی زۆر بە ئاسانی ناوێك دروست دەکەن و دووشاهیدیشی لە سەر قووت دەکەنەوە .. ئەوبێ ویژدانانە هەزارو یەك شتی لە سەر دەدۆزنەوە ، بێ ئەوەی مافی ئەوەی بدەنێ بەرگری لەخۆی بکات).

- پێمان بڵێ کاتی ئەوەمان نیی یە رۆژ لە گەڵ تۆ بەسەر بەرین ...

- ناتوانم ئەوەی ئێوە دەیڵێن من بیکەم ..

- ئێستا پێمان ناڵێ ی بۆ تۆزێك هۆش وەبەرخوتدا ناهێنیەوە ..؟ بۆ بە دوو ووشە بەختیاریەکی هەتا هەتایی بۆ خۆت دابین ناکەی .. لە پارە چەندی دەتەوێ ..؟ خانوو ئۆتومبیل لە بەر دەستت دایە ، لە سەر چ ئیشێك دەڵێ ی دات - دەمەزرێنین ... دوژمنایەتیت لە گەڵ کێ هەیە ..... رقت لە کێ یە .. دەیگرین ، دەیکوژین ، چ دەڵێ ی وای لێ دەکەین ...

- نا ... نا ... هەرگیز من رقم لە کەس نایێتەوە ... دوژمنایەتیم لە گەڵ کەسدا نیی یە .. هەموو کەسێکم خوش دەوێ ...

- دەباشە چ داوایەکی دیکەت هەیە بەسەرچاوان

بۆت جێ بە جێ دەکەین . ئەوەی لە سەر تۆیە ، پارەتیەکی بچوکی ئێمە دە دەی ، ئێمە قەت شتێکی وا داوا ناکەین کە جێ بە جێ کردنی لە تواناندا نەبێ ... ( پارچە کاغەزێکی گەورەی لە چەکمەجەی مێزەکەی هێنایە دەرێ ) و گووتی : ئەم کاغەزەی کە دەیبینی ، ڕاپۆرتێکە لاوێکی وەکو تۆ لە سەر بابی بۆی نوسیوین  بابی پیاوێکی باش نیە، گێرە شێوێنە ، ئەم لاوەش زۆر پیاوانە چ لە بابی دەبینێ و دەبیستێ، لەگەڵ کێ هەڵدەستێو دادەنیشێ ،دەیکا بە ڕاپۆرتێك و بۆ ئێمەی دەنێرێ ، ئێمەش بۆ ئەو کردەوە مەردانەیە، هەرجارەی مستێك پارەی لە دەست دەکەین . ئەوەیە عەقڵ، ئەوە بە دڵسۆزی بۆ نیشتمان ، بەرژەوەندی خۆی دەزانێ لە کوێیەو بەسەر بابی دا باز نادات .. ئێمە خۆ ئەوەشمان لە تۆ داوا نەکردوە ، ئەوەی لە تۆمان دەوێ ؛ شوێنی هاوڕێکانتمان پێ نیشان نەدەی و ئیمزایەکی بچکۆلەشمان لە سەر ئەم کاغەزە بۆ دەکەی ، ئیدی تۆ ئازادی ...

- ناتوانم ئەوە بکەم ..

- باشە ئێستا چیت لێ بکەین ..؟ هەی کوڕی سەگ

هەی دایك حیز، توخوا شێتا پەل پەلت کەین کێ دەلێ خەتاتانە ...؟ بیبەن لە بەر چاومی مەهێلن ... بیبەن ..

هەرئەوەندەی خۆش بوو تا لەدەرگاکە چوە دەر ێ .. بە شەق و زللە، شەلم کوێرم ناپارێزم، لەسەری لە پشتی لە دەست و قاچی بەربوون . شازاد نەیدەزانی شەوە یان رۆژە ... تەنانەت رێگای ئەوەی نەبوو هاوار بکات .. بەجۆرێك کەوتبونە سەری کە دەیگووت لە بن ئەم لێدانە شێتانەیەدا دەرناچێت و کاسەی سەری دەتەقێ یان پشتی دەشکێ، بە هیچ لە کۆلی نەدەبونەوە، تاوای لێ هات ئاگای لە دنیا نەما ...

کاتێك چاوی کردەوە دیتی لە ژوورێ راکشاوەو خالیدیش لە تەنیشتیەتی . وای دەزانی سەری هێندە ئەستور بوە کە رەنگە ئیدی نەتوانێ راستی کاتەوە . کەتەماشای شان و ئەپلکی خۆی دەکرد لە پێستێکی شین و مۆر زیاتر چی دیکەی نەدەدیت . . دەیان برین لە لەشی دا بوون . لەبەر خۆیەوە دەینالاند ....

خالید لێ ی چوە پێشێ و گورتی بـ

- چۆنی ..؟

- چۆن بم ..!؟ هەموو جومگەو ئیسکەکانی لە ئیم تێك شکاون .. بەلاّم لە گەلّ ئەوەشدا هەر باشم

- خۆزگە بمتوانیبا .. کارێکی وا بکەم هەموو برینە-کانی لەشت چاك بکەمەوە و ئازار لە گیانت دا نە-هێلّم ..

- سوپاست دەکەم .. دلّنیا بە کە ئازارێکی زۆرت لە سەرم کەم کردۆتەوە ..

- تۆش دلّنیا بەکەخۆت ڕابگری هەموو برینەکانی لەشت بە ئاسانی چاك دەبنەوە ..

- خالید گیان نازانم چی بکەم .. وەختە شێت بم .... ئەو دڕندانە ، ئەو بێ ویژدانانە ، بەمن دەلّێن تۆ پیاوێکت کوشتوە .. ئاخر من و پیاو کوشتن !! من ئەو کەسەم پیاو کوشتنم لە دەست بێ !! خۆ هەرچی بیشی لێ ی ئەو فاشیستانە نایبیستن ....

- ئازاد گیان گوێ مەدە ئەو شتانە .. ئەوانە فێری ئەوەن کە زانیان یەکێك سەر شۆڕناکا ، بەوە دەیترسێنن کە تاوانێکی گەورەی بدەنە پالّ ، ئەو شتانە وابزا-نە بایەو بە بن گوێت دا دەڕوا .. کورە نەکەی هیچیا ن

بـــۆ ئیمزا بکـــەی ..

- دڵنیا بە کە ناتوانن لەو بڕیارانەی کەلە گەڵ خـــۆم داومە پەشیمانم کەنەوە .. چونکە بە جۆرێك ئەوانـــەم ناســـیوە کە هیچ شـــتێك نی یە ڕق و قینم بەرامبەریسان دامرکێنێتەوە .. هەرچەنـــدە مـــن لە ژیانم دا دڵـــم نەهاتـــوە هیچ گیانداریك لـــەناو ببەم، بەلام بڕیـــارێ گەر جارێکـــی دی لە دەســت ئەوانە دەربازبم لەکوشتن و لەناو بردنیان درێغی نەکەم ..

- بەلام دەبـــێ ئەوە بزانین بە کوشـــتن و لەناوبردنـــی چەنـــد کەســـێك شـــتەکە کۆتایی پێ نایێ ،بەڵکو دەبـــێ خەبات بۆ هەڵتەکاندنـــی هەمور داو دەزگاکە بەیەکـــەوە بکـــرێ ...

++++++++++++++++

دوانیوەڕۆیەکـــی درەنگ بەدوای ئازاددا هاتنەوە ، هێندە ئێش و ژان لەلەشـــی دا بـــوو، کەنەیدەزانـــی چۆن دابنیشـــێ ، لەســـەر چلایەك ڕابکشـــێ ، بۆیە پـــێ ی وابـــوو ئەگەر ئەوڕۆ بەك داری دیکـــەی لی دەن ، دەمرێت.

کاتێك دەرگای ژووری تەحقیقیان کـردەوە و بەژوورکەوت ئەوەی دیتـــی هەرگیـــز چاوەڕێ ی نەدەکـــرد ، خەریك بوو

دڵی ڕاوەستێ ، هەموو ئەو هاوڕێیانەی کە ئامادە بوو بە ژیانی خۆی بیان پارێزێ لەوێ بوون ، ئارەزووی دەکرد لەو کاتەدا بمردایە بەڵام ئەوەشەبینێ. دەیویست پێ یان بڵێ :ـ ( هاوڕێ کانم باوەڕم پێ بکەن من ناوم نەدرکاندون ، من شوێنی ئێوەم ئا ـ شکرا نەکردوە ، باوەڕم پێ بکەن .. سوێندتان بۆدەخوم ...)

ئازاد کەمێك لێ یان وورد بۆوە ، دیتی؛ چل وبەرگی ڕێك و پێك ، پۆشتەو پەرداخ ، بەڕیز لە سەر کورسی دانیشتون و چا لە بەر دەمیانە .. لە دڵی خۆیدا گووتی :ـ ( نەخێر.. ئەمانە زیندانی نین ، خوایە چی دەبینم ...!!؟

کابرای وورگ زل گووتی :ـ

ـ ئەوەش برادەرە خۆشەویستەکانت ، کەخۆت لەسەریان بەلێدان و کوتان دا ، ئەوانەی کە گوایە نایان ناسیو پەیوەندیت پێیانەوەنی یە ، ئەوانە بە پێی خۆیان هاتوون و دانیان بە هەموو ئەو شتانە دا ناوە کە کردویانە ، پەیوەندیان بە کۆوە هەیەو کێ دەناسن، هەمویان ئاشکرا کردوە بەڵینیشیان داوینێ و ئەم ئیمزایانەشمان لێوەرگرتون ،( دەستی لەسەر ئەو کاغەزانە

داناکە لەبەردەمی دابوون )، کە ئیدی لەمەودوا لە
گەڵ ئێمە نەبێ لەگەڵ هیچ هێزو ڕێکخراوێکی سیاسی
دیکە دا کار نەکەن ...

پاشان جەنگی جەلال ڕووی لە شازاد کردو گووتی :
- شازاد پێویستە ئینسان بیر کردنەوەو لێك دانەوەی
هەبێ، ئێمە هیچمان لە فەرهادو ئەوانەش کەلەسەرووی
ئێمەوەن زیاتر نین، ئەوان هەرچی هەیەو نیی پێمە
گووتویانە، ئیدی ئێمە بۆکێ ی بکەین ..؟ بۆ خومان
دەربەدەرکەین، لەپای چی خۆمان بە لێدان و کوتان بدەین
..؟ داوات لێ دەکەین وازلە کەللە ڕەقی خۆت بێنە ،
خۆتۆ زۆر هێمن ولەسەرخۆ بوی ..!! چیت پێ دەڵێن وابکە ،
هیچ کەس نەماوە تابە تەمای بی و دڵت خوش بێ
بەوەی لەپێناوی شتێکدا ئازار دەچێژی ...

شازاد لەدڵی خۆیدا بە جەنگی دەگووت :( جەنگی
تۆش ... تۆش کە ئاموژگاری منت دەکرد .. ڕێ و شوێنت
پێ نیشان دەدام، ئێستا بە پێی خۆت هاتی،ترسنۆ-
کیش ئاوا .. بێ باوەڕیش بەو ڕادەیە ..!! شەرمە بۆتۆ
ئەوقسانە بۆمن دەکەی .. شەرمە بۆ هەموتان
کە درۆ لە گەڵ خۆتان دەکەن. ئاخر بۆچی ئێمە لە بەر
خاتری یەکتر ئەو ڕێگایەمان هەڵبژارد، تالەبەر خاتری

یەکتر وازی لێ بێنین ..!!؟ چۆن ئەورێگا پیرۆزە بوئەوتاوانبارانە، بۆئەو درندانە، وازلێ دێنن ..!؟ ئێوە شارەزووی خۆتانە، ئەوەی دەیکەن بیکەن بەلام من ئەگەر بەتەنهاش لەم زیندانەدا بمێنمەوە، پێ ی رازیم )

کابرای وورگەزل رووی تی کردو گووتی :-

- ئەوجا چدەلێ ی ..؟ خۆ قسەت نەما، ئەوا هەموو رێگایەکت لێ بردرانەوەو ئیدی ناتوانی بە درۆو دەلەسەو پێچ و پەنا خۆت دەربازکەی .. ئەوداوایەشت لە کۆل بۆوە کە دەمانگووت شوێنی هاوری کانتمان پێ نیشانده، ئیستا ئەوەی لە سەرت پێویستە زۆر سوولو شاسانە، ئیمزایەکی بچوکمان بۆ بکەو بەلێنی ئەوەشمان بدەیێ کە ئیدی جگە لەئێمە لەگەلێ هیچ هێزو لایەنێکی دیکەدا کار ناکەی ..

- پێویست ناکا هیچ شتێك ئیمزا کەم ..

- ئێمە دەلێین پێویست دەکاو شاخیرەکەشی دەبێ هەر بیکەی ..

- پێم وانیە بتوانن بەزۆر ئەو شتەم پێ بکەن چونکە من مافی ئەوەم هەیە کە ئەو شتە بە شارەزوی خۆم بکەم ...

- بە چ یاسایەك مافی ئەوەت هەیە، قوربان ..!؟

- بە هەموو یاسایەکی مرۆڤایەتی ...

- ئاوا ... !! یاسای مرۆڤایەتیش دەزانی چی بە ..!؟وا چاکە ئێمەش فێر کەی ..!

- نەخێر من ئەوە نیم ، بتوانم خەڵکی فێری شت کەم ، چونکە من هیچ نازانم ، بەلام ئەوەندە دەڵێم کە ئێوە ناتوانن بە زۆر ئەو شتە بەمن بکەن کە دەتانەوێ ....

- ئەورۆ قسەی لە خۆت زل تر دەکەی ..!! مەسەلە چی بە ..!!؟

- نا ... ببورن ، پێم وایە هەقی ئەوەندە قسە کردنەم هەیە ..

سەرێکی هەلتەکاندو گووتی:-

- بیبەنەوە ژوورەکەی خۆی ..

ئازاد پێ ی وابوو کە دەیبەن و لە هەموو جارێك زیاتری لێ دەدەن ، چونکە جاران هیچی نەدەگوت ئەوە مردویان دەکرد ، ئەدی ئێستا کە بە ڕەقی قسە ی لە گەڵ کردون دەبێ چی لێ بکەن ..!! بەلام بە پێچەوانەوە ، هیچیان لێ نەکردو بۆ ژوورەکەی خۆیان بردەوە ..

خالید بە شادمانیەکەوە ڕووی تێ کردو گووتی:-

- پـێ ناچێ لێیان دابێ ..!!

- نەخێر بەڵام بریا بیانکوشتمایە و ئەوەم نەدیبایە کە دیتم ...

- چیت دیت ..؟!

- هەموو هاوڕێکانم بە بێ ئەوەی کەس شوێنی زانیبێ ، بە بێ ئەوەی کەس توانیبێتی بیانگرێ ، خۆیان بە پێی خۆیان هاتوون و دەیانەوێ منیش وەکو خۆیان سوك و ڕیسوا کەن نازانم ئەمە چ شتێکی تازە بابەتە .. من نەمدیوە ئینسانێکی تێکۆشەر .. هۆشمەند... خاوەنی ڕابوردوویەکی باش ، بە پێی خۆی بێ و کڕنۆش بۆ دوژمنی مرۆڤایەتی ببا ...!!!

- پێت سەیر نەبێ ... ڕاستە تۆ یەکەم جارە ئەو شتە دەبینی ، بەڵام چەندان جار شتی وا ڕووی داوە ، ئەو جۆرە کەسانە هەرلە بناغەدا بیرو باوەڕەکەیان پتەوو داڕێژراو نییە، جگە لەوە تووشی ڕەش بینی و بێ هیوایی دەبن . بۆیە لە سەر مرۆڤی خەباتگێڕ پێویستە هەمیشە ڕووناك بین و خاوەن هیوایەکی بەرز بێ ..

- باشە شتیکی دی کەزۆرم پێ سەیرە ... من ڕۆژان هیچم نەدەگووت، کەچی هەرلەخۆیانەوە بیانویان پێ

دەگرتم و لێ یان دەدام ، ئەمڕۆش دەتوانم بڵێم بە ڕەقی قسەم لەگەڵ کردوون کەچی نەك هەرلێ یان نەدام بەڵکو تەنانەت جنێوێکیشیان پێ نەدام .

- ڕاستیەکەی منیش قسەم نەکردوە دەنا لە نیوەڕۆو . هەستم بە هەندێك گۆڕان کردوە ، تەنانەت ئەگەر دیقەتت دابێ خواردنی نیوەڕۆمان لە هی هەموو ڕۆژێك زۆرتر بوو ، هەموو تێرمان پێ خوارد ، هەرلەو وەختیشەوە لەهیچ کەسێکیان نەداوەو جنێوو قسە سوکەکانیش نەماون .

- ڕاستیەکەی من وام لێ هاتوە چاوەڕێ ی هیچ چاکەیەك لەوانە ناکەم ، ئەگەر هێمنی و قسەیەکی خوشیشیا ن هەبێ بە پیلانێکی تازەی تێ دەگەم .

- زۆر ڕاستە مەگەر شتێك لە دەرەوە ڕووی دابێ .

- چی ڕوو دەدات ؟!... ئەگەر شتێك ڕووی دابایە چۆن ئێمە هەر لێرە دەبوین ..

- کە دەڵێم شتێك مەبەستم ئەوەنیە ڕژێم ڕوخابێ .... بەڵکو زۆر جار هەواڵی ئێمە کە دەگاتە دەرەوەی زیندان ، یان دەرەوەی وڵات خەڵکێکی زۆر لەسەرمان بە جوا ب دەبن ، جا کاربەدەستان لە ژێر فشاری ڕای گشتیدا ناچار دەبن تا چەند ڕۆژێك ڕەفتاریان لەگەڵ بەندیەکان

لە جاران باشتر بکەن ...

- تۆ بڵێی کەس هەبێ بزانێ لێرەدا چی ڕوودەداتوچی بە ئینسان دەکرێ ..؟

- دڵنیام کە دەزانرێ و ئەو ڕاستیانە تا سەر ئاشکرا دەرێنەوە ....

++++++++++

نانی ئێوارێ یان دەخوارد خالید بە ئازادی گووت وـ

- چاوت لێیە ئەمنەکان لە جیاتی قسەی سووك لە گەڵما پێ دەکەن ...؟

- بەڵێ ئەوە شتێك نی یە ئینسان هەستی پێ نەکا بەڵام زۆرم پێ سەیرە دەبێ چی ڕووی دابێ..؟

دوای نان خواردنیش هەموو بەندی یەکان لەژووری دوو دوو و سێ سێ، سەریان بەیەکەوەنابوو، مقۆ مقۆیان تێ کەوتبوو، دیاربوو، هەموویان هەستیان بە شتێك کردبوو، بەڵام کەس نەیدەزانی مەسەلە چی یە، سەعاتێك ، دووان ڕۆیشت کەس نەهات بەزۆر بیان نوێنێ ..!

پاش ماوەیەك ئەمنێك هات و ئاگاداری کردن کە هەموویان بێنە دەرەوەو لە حەوشە کۆبونەوەیان پێ دەکەن ...

کاتێك چونە دەرەوە زیاتر لە (٦٠٠) بەندی لە

حەوشەکەدا کۆکرابونەوە ..

شازاد گووتی :ـ

ـ خالید ، تۆ دەڵێی چیمان لێ دەکەن ..؟

ـ راستیەکەی شازاد من لە خۆمەوە ناتوانم هیچ شتێك بڵێم .. بەڵام ئەوەندە هەیە چاوەڕێی هیچ شتێکی باشیان لێ ناکەم ..

بەندی یەکان هەموو بە چەند ریزێك وەستابوون ، چەند لێ پرسراوێکی ئەمنیش بەرامبەریان راوەستابون ، یەکێك لەوانە ئەو وورگەزلە ناقولایە بوو کە تەحقیقی لە گەڵ شازاددا دەکرد ..

بەندی یەکان دڵە کوتەیان پێ کەوتبوو ، چاوەڕێی شتێك بوون ، زۆر بە پەلە بوون تائەوانەی بەرامبەریان بەقسە بێن ..

یەکێك لە لێ پرسراوەکان رووی لە بەندی یەکان کردو گووتی :ـ

ئێمە کە ئێوەمان لێرە کۆکردوتەوە دەمانەوێ مژدەیەکی خۆشتان پێ رابگەیەنین .. دیارە لەسەر بریاری سەرکردەی مەزنمان ، هەرچی بەندی هەیە لە بەیانی یەوە شازادەو هەموو بەردەبن ..

( بەندی یەکان دەستیان بە چەپڵە ڕێزان کرد و

هەریەکە بەجۆرێك بەسەرکۆماری هەڵادەگووت ..)

کابرا لەسەر قسەکانی رویشت ..

- داواشمان ئەوەیە کاتێك دەچنە دەرەوەو خەڵکی باسو خواسی شێرەتان لێ دەپرسن نابێ بە هیچ جۆرێك ئەوەی دیوتانە یان تووشی هاتوون بۆ نمونە ئەگەر ئەمنێك هەڵەیەکی بچوکی بەرامبەر کردبن لای کەس باسی بکەن بەڵکو دەبێ بڵێن وەزعمان زۆر باش بوە، خزمەتی چاکیان کردوین، دەنا دوایی هەرکەس هۆبالی خۆی لەئەستۆی خۆی. داواشمان ئەوەیە هەریەکێك لە ئێوە بەرامبەر سەرکۆماری مەزن و لەپاداشتی ئەو چاکە گەورەی لەگەلی کردون، دەبێ ببێتە سەربازێکی دلسوزو تا مردن ئەو چاکەی هەرلەبەرچاوبێ .......

یەکێك لە بەندییەکان لەولاوە هاواری کرد :-

- چاکەس هەبە هێندە بێ ویژدان بێ و ئەو چاکە گەورەی لە بیر بچێتەوە .... هەربژی سەرکۆمارو سەرکردەی مەزنمان ....

(هەموو بە چەپڵەوە بۆیان ساندەوە ..)

خالید رووی لە شازاد کردو بە گاڵتە پێ کردنێکەوە گوتی :-

- بەراستی چاکەیەکی گەورەیە، هەرمرۆڤی بی گوناە

بگـــرن و پاشـــان بەری بدەنو بیکەن بە منەتێکـــی گەورە بە ســـەریانەوە ..

شازاد بە ســـەر سورمانێکەوە گووتی :-

- ئەوە چیە خالید دەلـــێ ی خوشـــحال نی بە بەربونت ..؟

- بەلـــێ خوشحالم .. بەلام هەرچەند دەکەم ناچێتە عەقلـ-مەوە کە هەروا بێ عارەق بهێلن لێرە دەرچین ..!!

- منیش ســـەرەتا باوەرم وا بـــوو بەلام ئێستا هیـــچ گومانم نی یە کە هەموومان بەردەبین ...

هێندەی پـــی نەچوو ناوی چەند کەسێکیان خوێندەو ، کەیەکێك لەوانە خالید بـــوو و بانگیان کـــردنە ژوورێك ، شازاد زۆر دەترســـا کە خالید قســـەکەی بێتە دی و ، توشـــی شتێکـــی بکەن ..!!

هێندەی پێ نەچوو هاتەوە ، شازاد لـــێ ی پرسی :-

- چـی بـــوو ..؟ بۆچی یان بانگکـــردی ..؟

- کورە بـــۆ هیچ ... چەنـــد کەسێکیان لەوانەی بە ئیعدام مەحکوم بووین لەژووریکدا کۆکردینەوە ، داوای لی بورد-نیان لێ کردین لەوەی لەو ماوەیەی لێرە بوین زۆریـــان ئازار داوین .. ســـەرو شـــەربەتێکـــی پرتەقالیشـــیان داینێ ، پێ یان وایە بە دوو قســـەی لوس و شەربەتـــێك ئیدی هیچمان لە دلدا نامێنی ....

( بەندی یەکان کۆمەڵ کۆمەڵ هەڵدەپەرین و چەپڵەیان لێ دەداو دەیانگووت (هەرپایەداربێ سەرکۆماری خۆشەویستمان ) یان ( تا مردن سەربازی تۆین ئەی سەرکردەی مەزنمان ) .....

خالید رووی لە شازاد کردو گووتی :-

- تەماشای ئەو خەڵکە هەژارو سادەیەکە ، نازانن بەبێ ئێمە لەودەرگایەوە بەردەدەن و بۆ دووبەی سەدان و هەزاران بێ تاوانی دیکە لە دەرگایەکی دیکەوە دێننە جێ یەکەمان ... تەنانەت هیچ گومانم لەوەدا نی یە ئەگەر لە گەڵ بەرپونمان فریای خۆمان نەکەوین ، سەرلەنوی دەگیرێینەوە .......

+++++
+++++++++++++++++

دووروژ پاش بەردانیان ، خالید لە ترسی ئەوەی نەوەك جارێکی دی بیگرنەوە ، بۆ دەرەوەی وولات رۆیشت ، بەلام هێندەی پێ نەچووبە سەختی نەخۆش کەوت .. کاتێك بۆ نەخۆشخانەیان برد پزیشکەکان بۆیان دەرکەوت کەماددەی ( سالیوم )ی دراوەتێ *.

---

* ژەهرێکی کوشندەیە ئەوەی دەیدرێتێ تا چەند روژ ←

خالیدو ئەوانەش کەلە گەڵ ئەو شەربەتی پرتەقاڵــــی ژەهراویان دەرخوارد درابوو مــردن ... بەڵام رێبــــازە مەزنــەکەیان هەرمایەوە .

بەڵـــێ زۆری وەکو ئەوانەی ئەمڕو لەســەر کـــارن ویســتویانە،ڕێگای خەبات و ژیان لە خەڵکی بگرن ، بەڵا م یەك لە دوای یەك ســەریان داوە لە بەردو، گەلیش وە ك قەڵایەکـی پۆڵاین هەرســەر بڵند ماوەتەوەو هـــــــەر دەشـمێنــــێ .

- تەواو بـــــوو -

---

بەســەردا تێ نەپەڕێ کاری لێ شاکاو هەست بە نەخۆشی ناکا.

لە وڵاتی ئێمەدا
پیاو کوژو دزو
جەردەو ئینسانی
ساختەچی دەستی بۆ
ئابڕوو و ئازادە، بەڵام
ئینسانی پاك و
نیشتمان پەروەرو دڵسۆز
دەگیرێو ئازار دەدرێ و
ئیعدام دەکرێ ........

نرخی (   )